## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردی بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەر ڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کورد بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری ڕابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی ڕاستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەندو بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکڕەوی و ڕەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ ڕێزو تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین .

با دەستورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

# موسلمانان وعەولەمە

نووسینی

محمد قطب

وەرگیڕانی

ابراهیم حسن سعید

پێداچوونەوەی

نەوا احمد سعید

تفسیر

١٤٢٧ هەولێر ٢٠٠٦

ناوی پەرتوک: موسڵمانان و عەولەمە
نووسەر : محمد قطب
وەرگێڕانی : ابراهیم حسن سعید
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
تــایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
بەرگ : أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یـەکـەم ١٤٢٧ك — ٢٠٠٦ز
تیــــراژ: ٢٠٠٠ دانــە
لەکتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی ( ٦٠٣ ) ساڵی ٢٠٠٥ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر لوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٢٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

# پێشەکی

ئیمرۆ موسوڵمانان سکاڵا دەکەن لە عەولەمە و ئەو ئایندە ترسناکەی، کە بۆتە هەڕەشە بۆیان، حەقیشیانە، کە سکاڵا بکەن، چونکە ئەوان لەپێشەوەی مەرام و نیازی عەولەمەن، با ناونیشانیان ((جیهانی سێهەم)) بێت، یان ((جیهانی ئیسلامی ))، یان (( ولاتە تازە پێگەیشتوەکان )) یان (( ولاتە دواکەوتوەکان )) یان (( ولاتە هەژارەکان ))!

بەلام موسوڵمانان -لەم سکاڵا و ترس و بیمەیان- کەم جار بە بیریان دادێت - کە بە هۆی- پشت کردن لە ئایینەکەیان و خۆ کێشانەوە لە فەرمانەکانی و لادانیان لێ ی، لە نێوان ئەم چەند سەدەی دواییەدا -یەکەم هۆی زەبونی و بێ هێزیانە، ئەوان- بە هۆی ئەم کەم تەرخەمیە لە ئاست ئایینەکەیان- ڕێگەیان خۆش کرد بۆ هێزێکی نەفامی وەحشیگەری، کەوا دەسەلاتی خۆی بەسەر جیهاندا بسەپێنێ، پاشان ئەوانیش لەسەر ڕێگای خۆیان لابدات و تێك بشکێنێ!

لەم چەند لاپەرە کەمەدا، دەمەوێ تیشکێکی خێرا بخەمە سەر چەند خاڵێك دەربارەی عەولەمە و هەڵوێستی موسوڵمانان لە بەرامبەریدا، کە پێشەکی باسەکەم لەسەر ڕەهەندەکانی عەولەمەیە، پاشان دەربارەی بەر پرسیاریەتی ئوممەتی ئیسلامە لەسەرهەڵدان و جێگیر بوونی عەولەمە، پاشان هەڵوێستی موسوڵمانان بەرامبەری لە رابردو و ئایندەدا.

با لە بیریشم نەچێ، تیشکێك بخەمە سەر هەڵوێستی (( عەلمانیەکان )) دەربارەی عەولەمە، کە خۆشحالیان بەهاتنی و مزگێنی دانیان پێ ی، کەوا عەولەمە ئەو ئامێرە راماڵە(البلدوزر)یە کەوا ئیسلامیان بۆ ڕیشە کێش دەکات،

پاش ئەوەی عەلمانیەکان خۆیان ماندوو بوون، هێندی بە پاچ و تەورەکانیان لە ئیسلام بدەن بۆ ئەوەی بیروخێنن و لە ڕەگ و ڕیشالەوە هەڵی بکەنن، بەلام کارەکەیان سەری نەگرت، جگە لە بەزین و سەر شۆڕی چی تریان بۆ نەماوە.

لە دوایی باسەکەم دا، تیشکێکی خێرا دەخەمە سەر ئاییندەی چاوەڕوان کراو: ئاییندەی عەولەمە و ئاییندەی ئیسلام.

ئەگەر چی ئەم چەند لاپەرە کەمە ناتوانێ مافی بابەتێکی ئەوها گرنگ و گەورە بدات، بەلکو ئەمە تەنها بەبیرهێنانەوەیە، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ و ذكر فأن الذكرى تنفع المؤمنين: تۆ هەر وەبیریان بخەوە، بیرەوەری بەهرە دەدا بەوانەی خاوەن باوەڕن ﴾.

و على الله قصد السبيل و منه العون وعليه التوكل و منه التوفيق..

محمد قطب

## ڕەهەندەكانی عەولەمە

زۆر خەڵك پرسیار دەكەن، بەتەواوی مەبەست لە عەولەمە چی یە؟
دوور لەو پێناسە تیۆریانەی، كە بۆ عەولەمە كراوە، نمونەیەك دەهێنینەوە، كەوا ڕەهەندەكانی واقعی عەولەمە ڕوون دەكاتەوە.
پێش ماوەیەك كە زۆر دوور نیە، وڵاتە بەرهەم هێنەكانی نەوت ویستیان بەرهەمی خۆیان كەم بكەنەوە، بۆ ئەوەی نرخی نەوت لە بازار بەرز ببێتەوە، دوای ئەوەی نرخی دابەزی، بە هۆی زۆری بەرهەم بێگومان نرخی هەستاوەو گەیشتە ئەو لوتكەیەی، كە پێشتر لە ساڵانی بازدان(طفرة) پێ ی گەیشتبون.
ئا لێرەدا زل هێزەكان.. یان با بڵێین زل هێزی گەورە رازی نەبوون، خۆیان هاتنە ناو ئەو مەسەلەیە بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر وڵاتە بەرهەم هێنەكانی نەوت، كە زیاتر بەرهەمی نەوت بنێرنە بازار، بۆ ئەوەی نرخی دابەزێتە ئەو ئاستەی، كە لەگەڵ چاوچنۆكی و ئارەزو و بەرژەوەندی ئەوان بگونجێ.
لە كۆتاییدا وڵاتە بەرهەم هێنەكانی نەوت ناچار بوون سەر دانەوێنن بۆ ئەم فشارەی كرا بووە سەریان و، لەژێر هەرەشەی سزادان، ناچار بوون بەرهەمی خۆیان زیاد بكەن بۆ ئەو ئەندازەیەی، كە داوایان لێ كرابوو، یان نزیك لەم ئەندازەیە!
ئەمە نمونەیەكی واقعی لایەنی ئابوری عەولەمەیە، كە پێویست بە كۆشش ناكات بۆ پوخت كردنی رەهەند و هۆكارەكانی. چونكە جیهانی سێ یەم -كە زۆربەی (نەوت) بەرهەم دێنێ، كە ئەمڕۆ لە پیشەسازی جیهان بەكار دەهێنرێ، كەوا موسوڵمانان لەوە پشكی هەرە زۆریان تێدا هەیە- و خاوەنی كەرستەی خاوی زۆرە، كە وڵاتە پیشەسازیەكان پێویستیان پێ هەیە، بەڵام جیهانی سێهەم

خاوەنی کارگەکان نییە، خاوەنی ئەو شارەزایی و تەکنۆلۆجیایە نییە بۆ ئەوەی کارگەکانی پێ هەڵبسورێنێ ئەگەر هەبێ. بەڵکو ئەوەی خاوەنی شارەزای و تەکنۆلۆجیایە، ڕۆژ ئاوایە -لە سەروی هەموان ئەمریکا- پاشان ئەو ڕۆژئاوایە، فشار دەخاتە سەر جیهانی سێهەم -کە هەژار و نەفام و زەبونە- بۆ ئەوەی کەرستە خاوەکانی بە هەرزانترین نرخ پێی بفرۆشێ، پاشان ڕۆژئاوا لەلای خۆی لە پیشەسازیدا بەکاری دەهێنێ و دەیکاتەوە کەل و پەل، پاشان ڕەوانەی جیهانی سێهەمی دەکاتەوە و، بە گران ترین نرخ پێیان دەفرۆشێت، کە لەمەدا ڕۆژ ئاوا لەیەك کاتدا چەند جارە قازانج دەکات: قازانجی ماددی و قازانجی مەعنەوی. ماددیەکە بە دابەزینی نرخی کڕین و هەستانی نرخی فرۆشتن، مەعنەویەکەش بەسەر شۆڕکردنی جیهانی سێهەم، کە بەردەوام هەست بکەن، کەم هێز و بچوك و کەمن لە چاو ڕۆژئاوا و، بەردەوام دەبێ بە دوای ئەوان بکەون و پاشکۆی ئەوان بن.

ئەم ڕووە لە ڕووەکانی عەولەمە، زۆر ئاشکراو دیارە پێویستی زیاتر بە روون کردنەوە نی یە!

بەڵام چەند هۆ(وسیلە)یەکی هەیە، زیاتر پێویستی بە ئاشکراکردن و ڕوون کردنەوە هەیە.

ئەو تایبەتیکردن(خصخصة)ی،[1] کە بەسەر وڵاتانی جیهانی سێهەم دا سەپێنراوە چەند ڕەهەندێکی هەیە.

لە ڕەهەندەکانیدا لابردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەسەر موڵکە نەتەوەییەکانی بە

---

[1] خصخصة: واتە گەڕاندنەوەی موڵکیەتی کەرتی گشتی بۆ تاك لەرێی فرۆشتنەوە.

جۆرێك وای لێدێت، كە دەوڵەت هیچ دەسەڵاتێكی نامێنێـت لـە قەدەغـەكردن و بەخشین و پاراستن و بەكارهێنانی، كە سود وقازانجی بۆ دەوڵەتەكە و میللەتەكـەی هەبێت، بەڵكو لە هەنگاوی یەكەمدا دەكرێتە موڵكی كەرتی تایبەت، بە بیـانوی ئەوەی ئەو كەرتە تایبەتە، تواناداترە لە بەڕێوەبردن و بەكارهێنانیدا، یـاخود بـە هەر بیانویەك بێت، كە ڕەنگە بیانوەكە لە خودی خۆیدا ڕاست بێت، بـەڵام هۆیـە ڕاستەقینەكە ناشارێتەوە!

لە هەنگاوی دووەمدا، بوارە تایبەت كراوەكان دەخرێنـە ڕوو بـۆ وەبـەرهێنانی جیهانی، لەم هەنگاوەدا سەرمایە جیهانیەكان دێن بەشـداری دەكـەن لـە كـردەی وەبەرهێنان، چەند مەرجێكی دیاری كراو دادەنێن بۆ بەرژەوەندی خۆیـان، لەوانـە كەم كردنەوەی باج لەسەریان و ڕێگە پێدانیان بـە گواسـتنەوەی دەسـت كـەوت و قازانجیان بۆ دەرەوە، دانەنانی كۆسپ و تەگەرە لە بـەردەمیان دا، وەكـو دروسـت كردنی پاراستنی گومرگی، یاخود هەر جۆرە پاراستنێك بۆ پیـشەسازیە خۆماڵیـە بچوكەكان، كـە سـەرمایەی نـاوخۆیی و مانـدووبونی خـۆی بـەڕێوەیان دەبـات. ئەمەیان -كە بەبێ پاراستنە- شكست دێنێت لە كێ بركێ كـردن لـە بازاڕەكـانی جیهانـدا، بـەڵكو لـە خـودی بازارەكـانی نێوخۆشـدا، لـە ئـەنجام دا دەگاتـە بەشداریكردن لەگەڵ سەرمایەی بیانی، یاخود بۆ لەناوچوون!

كەواتە عەولەمە لە ڕوی ئابوریەوە بە نیسبەت -جیهانی سێهەم- هـەر هـیچ نەبێ ئەو زاڵبونە ڕاماڵەو پشت شكێنەرەی سەرمایەی ڕۆژ ئاوایە بەسـەر ئـابوری جیهانی سێهەمدا، لەگەڵ دانانی ئابوریەكەی لە نێوان هەردوو لای ماشەدا، ئەنجا چ بە دابەزینی نرخی كەرەستە خاوەكان بێت، یان بەرز كردنـەوەی نرخـی بەرهـەم

هێنان، لەگەڵ سڕ کردنی ئەو وڵات و گەلانەی بەوەی، کە ئارەزویان دێنێتە دی لە پەرەسەندنی ئابووری، کەوا لە ئەنجامی هاتنی عەولەمە لە جیهانی سێهەم ڕوودەدا، کە ئەم پەرەسەندنە ئابوریە یارمەتیان دەدات بۆ دانەوەی قەرزەکانیان، لە گەڵ کردنەوەی دەرگا بۆ ئەو کەسانەی بێ ئیش و کار دانیشتینە، کە ئیش و کاریان بۆ دابین دەکات و، لەو سەخڵەتیەی ئەمڕۆ تێی کەوتوونە ڕزگاریان دەکات، بەڵێنیان پێ دەدەن کە ئەمانەیان لە ماوەیەکی زۆر نزیک بۆ دەکەن، بەڵام دەرئەنجام و ئاکامی ئەم کارانە لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی ئەوەی، کە ئەو گەلانە دەستبەرداری بنەماکانی بوون و کیانیان بەلاوە بنێن، پاشان ڕۆژ ئاوا زاڵ بێ بە سەریاندا و فەرمان ڕەوایی کردنێکی تەواو بەسەر چارەنوسیاندا.

ئێستا پرسیارێکی زۆر گرنگ بە دێتە بەرچاو.. ئەویش:

کێ خاوەنی سەرمایەی گەورەی بێگانەیە، کە دێت بۆ وەبەرهەم هێنان پاش ئەوەی هەموو دەرگاکانی لەسەر پشت بۆ دەکرێتەوە؟!

بەڕاستی –ئەگەر بمانەوێ و نەمانەوێ- سەرمایەی جولەکەی جیهانە، کە لە وڵاتی خۆیدا زاڵە بەسەریداو، هەوڵ دەدا بۆ زاڵ بوون بەسەر هەموو جیهاندا!

لێرەدا ڕوێکی تری عەولەمە سەر هەڵدەدا، کە شوێنەوارەکەی هیچی کەمتر نی یە لە زاڵ بوونە ئابوریەکەی، بەڵکو لە دیدو بۆچوونی ئێمەدا ترسناک ترو توند ترە!

بەڕاستی پلانی داڕێژراوی جولەکەکان بۆ نەتەوەکان (الامیة) –کە هەموو نەتەوەیەك جگە لە جولەکە دەگرێتەوە- هەر وەکو کە لەپەرتوکی (تلمود) هاتووە، کە نەتەوەکان (الامیین) گوێدرێژن، خودا دروستی کردون بۆ ئەوەی گەلی

هەڵبژێردراوی خوا (شعب الله المختـار) سواری پشتیان بێ، دەڵێن: لە چاکەی خـوا لەسەر گەلی هەڵبژاردراو ئەوەیە، کە ئەو گوێدرێژانەی لەسەر وێنـەی ئـادەمیزاد دروست کردوە بۆ ئەوەی ئەو گەلە هەڵبژێردراوە بتوانێ بەکاریان بێنێ!!

بێگومان لەسەر ئەم روانینە چەند شتێکی زۆر ترسناك دروست دەبێت:

ئەویش کەی مرۆڤ دەبێتە گوێ درێژ.. چۆنیش دەکرێتە گوێ درێژ؟!

خودای بالاّ دەسـت لـە قورئـانی پـیرۆز دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَـدْ كَرَّمْنَـا بَنِـي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً: ئێمە رێزمان لە نەوەی ئادەم گرت و لە وشـکانی و لـە زەریـادا هـەڵمان گرتن، رۆزی پاکژمان پێداون، لە چاو زۆر لە کـردەی خۆمـان زۆر پـتر قـەدرمان گرتون﴾.اسراء: ٧٠.

کەواتە مرۆڤ لە بنچینەدا رێزدارە.. بەڵام -لە چـەند حـاڵ و بارێکـدا- خـۆی دێنێتە پلەی خوارەوەی خـوارەوە ﴿ ...لَهُـمْ قُلُـوبٌ لاَّ يَفْقَهُـونَ بِهَـا وَلَهُـمْ أَعْـيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَئِـكَ كَالأَنْعَـامِ بَـلْ هُـمْ أَضَـلُّ أُوْلَئِـكَ هُـمُ الْغَافِلُونَ: دڵیان هەیە و پێی تێ ناگەن، چاویان هەیـە و پێـی نـابینن، گـوێ یـان هەیەو پێی نابیستن، ئەوانە وەکو ئاژەڵن، بگرە لەوان گومڕاترن، ئاگایان لـە هـیچ شت نیە﴾ أعراف: ١٧٩.

﴿ كَأَنَّهُمْ حُمُرٌ مُّسْتَنفِرَةٌ، فَرَّتْ مِـن قَـسْوَرَةٍ: دەت وت ئـەوان گـوێرە خەرگـەلی رەقوکن، کە لە ترسی شێر هەڵاتوون﴾ مدثر: ٥٠-٥١.

ئەمەش کاتێك وایان بەسەر دێت، کە روو لە پەرسـتنی خـودا وەردەگێـرن و، جگە لەو دەپەرستن...

یان مانای ئەمە بە گوزارشێکی تر ئەوەیە، کە ئەو مرۆڤەی خاوەن عەقیدە بێت، خاوەن باوەڕ و ئەخلاقێك بێت، کە لە عەقیدەکە هەڵقولاّ بێت، ناکرێتە گوێ درێژ..

باشە ئەگەر ئامانجمان ئەوە بێت مرۆڤەکان بکەینە گوێ درێژ -کە مەبەستمانە- دەبێ چ بکەین؟

وەڵامەکە ئاشکرایە: عەقیدە و ئەخلاقیان تێك دەدەین!

ئەمە بێگومان کۆنگرە نێو دەوڵەتیەکان پێی هەڵدەستن، کە کات ناکاتێك دەبەسترێت، بۆ ئەوەی شەرعیەت بدەنە بەد ڕەوشتی و نەوازەیی جنسی(شذوذ الجنسي) و سەربەستی لە بارچون ( الاجهاض ) و، پێك هێنانی خێزانێك بەبێ ژن و مێرد و، نەهێشتنی دەسەلاّتی باوك لەسەر هەڵس و کەوتی منداڵەکانی و ئازادی بیروڕا، کە مەبەستیان ئازادی بێبڕوایی(الحاد) بونە!

ئەم کۆنگرانە وە نەبێ بە شێوەیەکی سادە ببەسترێن! بەڵکو -لەگەڵ ئەوەی کە زۆر دزێوو قێزەونە- بەشێکە بەوردی لەلایەن پلانگێڕی گەورەو خراپەکار بەوردی دیراسە کراوە، ئەوانەی بەم کارە دزێوە هەڵدەستن تێك دەری زەوین: ﴿... وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ: هەر بەدفەری پیشەیانە و دەیانەوێ خراپە بەرێوەبەرن و خودا لە خراپە کاران خۆشی نایەت﴾ مائدة: ٦٤.

ئەم کۆنگرانە وەنەبێ تەنها شتێك بن بۆخۆیان ببەسترێن، با ناونیشانی تایبەتی بۆ دابنێن، وەکو کۆنگرەی دانیشتوان ( السکان ) یان کۆنگرەی ژنان (المرأة ) کە لە ساڵی (٢٠٠٠ ) بەسترا، یان جگە لەمانە، بەڵکو بەستنی ئەم کۆنگرانە بەشێکی پێکەوە بەستراون -با ئاراستەشیان جیاواز بێت-

بەسەرپەرشتی و بەڕێوەبردنێکی یەکگرتو کار دەکەن، هەروەکو پێیەکانی هەشتپێ(الاخطبوط) هەریەکە بە ئاڕاستەیەکدا پەلی هاویشتوە، لێرە گازێك دەگرێت لەوێ گازێك، بەڵام بە بەڕێوەبردنێکی یەکگرتو، کەوا جێگیرە لەنێو سەری هەشتپێ(اخطبوط)دا!

کاتێك ئەم کارە بە شێوەی کۆنگرەی نێودەوڵەتی دەبەستن و هەوڵ دەدەن لەرێگای دەزگای نەتەوەکان و (هیئة الامم) بەسەر خەڵکی بسەپێنن و، هەڕەشە لەوانە دەکەن کە پێی رازی نین -بە تایبەتی موسوڵمانەکان- بە دانانی سزا لەسەریان، ئەگەر بێت و بڕیارەکانی جێبەجێ نەکەن.

ئەمانە هەمووی چەند بەڵگەو نیشانەیەکی هەیە..

بەڵگەو نیشانەی یەکەم ئەوەیە، کە بەڕاستی توانرا چەند کەسانێك بکرێنە کەر، کە زۆر بە بوێری و بێ شەرمیەوە بە ئارەزو و هەستی شەیتان قسە بکەن، داوا دەکەن بە ئاشکرا سەرپێچی خواو فەرمانەکانی بکرێ، حەرام حەلال بکرێ و حەلاڵ حەرام بکرێ و یاسا دابنرێ بەبێ ئەوەی خوا ناردبێتی، لەبەر خاتری ئەمە چەند کۆنگرەیەك گرێ دەدەن، کە تیایدا ئاشکرای هەموو شتێکی عەیب و قێزەون دەکەن، کە هەرگیز ئەم کارە بەتاوان نازانن و شەرم نایان گرێ. بە ڕاستی ئەم ڕەوشتەیان جۆرێکە لەو نزمیەو دابەزینەی، کە مرۆڤایەتی تاکو ئێستا لە مێژووی خۆی نەگەیشتۆتە ئەم ئاستە. بەڵێ ئەوەی ئەوانە بانگەشەی بۆ دەکەن لەم ڕەوشتە خراپانە، ئەوا لە مێژووی نەتەوەکان، رووی داوەو نمونەی هەبوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك شەرعیەتی نەدرایتێ، بەڵکو بە پەنهانی، یان نیمچە پەنهانی ئەنجام دەدرا، پاشان ئەوەندەش بەربڵاو نەبوو، چونکە دەروونی مرۆڤەکان -کە

خوا ڕێزی گرتوە- بە ئەستەمی ئەزانێ ئەگەرچی سەرلێ شێواویش بوو، کە بەناوی ئاشکراو ڕووت، خۆی بێنێتە نزمی گیانلەبەرو خەریکی ئیشی ئەو بێ. بەڵێ حاڵەتی ناواز(شاذ) هەبووە وەکو گەلی پێغەمبەر ( لوط ) سەلامی خوای لەسەر بێ، بەڵام شێوەی گەلی ( لوط ) بە نیسبەت هەموو مرۆڤایەتی شێوەیەکی تاك ڕەوە، بە نەفرەت بووە لە زەمین و ئاسمان، بەڵام ئەمڕۆ دەیانەوێ بە ئاشکرا، شەرعیەت بدەنە ئەو نزمی و دابەزینە، بۆ ئەوەی هەر ئەوە ببێتە بنچینەیەکی بڵاو لە ناو خەڵکیدا!

بەڵگەو نیشانەی دووەم ئەوەیە، کە بەدڕەوشتەکان، تەنها بە بەدڕەوشتی واز ناهێنن و بەو ژمارە کەمە لەو گوێدرێژانەی، کە لەژێر دەستیانیان قەناعەت ناکەن، بەڵکو زیاتر داوا دەکەن! دەیانەوێ هەموو مرۆڤایەتی بکەنە کەر، بە کەرکردنیش(الاستحمار) ئەنجام دەدەن بەو ئامرازە ( نێو دەوڵەتیانەی! ) کە لەژێر دەستیان دایە، بۆ بڵاوبونەوەی بەکەرکردن لەنێو مرۆڤایەتیدا.

بەڵگەو نیشانەی تایبەتی، کە نابێ ئێمەی موسوڵمانان لە دەستمان دەرچێ ئەوەیە، کە ئەوان مەبەستی سەرەکی و ئامانجی سەرەکیان ئیسلامە، ئەوانە ناسرەون، هەتا موسوڵمانان لە دینەکەیان هەڵ نەگەڕێننەوە.. ئەگەر بۆیان بکرێ: ﴿...وَلاَ يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّىَ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُواْ...: ئەوان بەردەوام دەگەڵ ئێوە بەشەڕ دێن هەتا _ ئەگەر بۆیان بلوێ _ ئێوە لە دینەکەی خۆتان وەر بگێڕن﴾ بقرە: ٢١٧.

* * *

کەواتە عەولەمە هەروەکو لەسەرەتاوە دەردەکەوێ، تەنها یەك ڕوو و لایەنێکی نییە، بەڵکو -هەروەکو بینیمان- شێوەیەکی هەشت پێی هەیە، کە هەریەکە لە ئابوری و ڕامیاری و فیکری و ئەخلاقی و ڕۆشنبیری و نەریت و عادەت دەگرێتە خۆی.

هەتا گریمان -ئەگەرچی ڕاستیش نییە- ئامانجی سەرەکی مەسەلەی ئابوریە، ئەم کارە بەبێ هاوکاری لایەنەکانی تر بۆیان سەر ناگرێ! چونکە ئەو گەلەی کە خاوەن دینێکن شانازی پێوە دەکەن، خاوەن ئەخلاقێکن شانازی پێوە دەکەن، ڕۆشەنبیریەکی جیاکار و، چەند بنەمایەکی سەرەکیان هەیە، داکۆکی لەسەر دەکەن و موکڕن لەسەری، ئەوە ئەوها بە ئاسانی سەر دانانەوێنن بۆ زاڵ بوونی ئابوری. ئەگەر چی با لە هەموو لایەك گەمارۆیان بدات، بەڵکو شانازیان بە دین و ئەخلاق و بنەمایان، وایان لێ دەکات بۆ ماوەیەکی زۆر بەرگری بکەن. بۆ ئەوەی ڕزگاریان بێ لەو بەندایەتیەو پەرستنەی، کە بەزۆر بەسەریاندا سەپاندویانە، بەڵام لەو کاتەدا هەشتپێ هەوڵ دانەکەی بە فیڕۆ دەچێت و بودەڵ دەبێتەوە! کەواتە دەبێت لەبەر خاتری زاڵ بوونە ئابوریەکەی خۆی، کەسایەتی نەتەوەکان بسڕێتەوە، بنەما دەروونی و فیکری و بیرو ڕایان بتوێنرێتەوە، بۆ ئەوەی سەرکردە کردنی لە لایەن شەیتان ئاسان بێت!

## بەرپرسیاریەتی ئوممەتی ئیسلامی

خودای گەورە ئەم ئوممەتەی هێنا کایەوە -کە ئومەتی یەکخواپەرستییە- بۆ ئەوەی چەند ئامانجێکی دیاریکراو بێنێتە دی:

بۆ ئەوەی ببێتە باشترین ئوممەت، کە بۆ مرۆڤایەتی هاتبێت، کە فەرمان بە چاکە بکات و، ڕێی خراپە بگرێ و بڕواشی بەخوا هەبێ: ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ...: ئێوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردومی دونیادا سەرو هەڵدا؛ فەرمان بەچاکە دەدەن و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن. باوەڕیشتان بە خوا هەیە﴾ ال عمران:١١٠.

بۆ ئەوەی ببێتە ڕابەرو پێشەواو شاهێد لەسەر هەموو مرۆڤایەتی: ﴿...وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَاء عَلَى النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا: بەم شێوەیە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئوممەتێکی هەڵبژاردە؛ تا ئاگاو لە مەردوم هەبێ و پێغەمبەریش چاودێریتان لێ بکا﴾ بقرة:١٤٣.

بۆ ئەوەی پەیامی ئەو پێغەمبەرە دواییە -سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ- بۆ هەموو مرۆڤایەتی هەڵبگرێ، لەو کاتەی کە هاتوە، هەتا ئەو کاتەی، کە خوای گەورە زەوی و ئەوەی کە لەسەریەتی دەگرێتەوە خۆی، بۆ ئەوە خەڵکی لە تاریکیەکان ڕزگار بکات بۆ ڕوناکی، لەسەر ڕۆشنایی و ڕێنمایی قورئانی پیرۆز، کە لەلایەن خودای باڵادەستەوە دابەزیوە: ﴿ الَر، كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ، اللّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ...: ئەلیف، لام، ڕا، کتێبێکە بۆ تۆمان ناردە خوارەوە، هەتا خەڵکی -بەئیزنی پەروەردگاریان- لە تاریکی بەرەو ڕووناکی وەگوێزێ؛

ڕێگەی خاوەن دەسەڵاتی شایانی هەمو ستایشێکە، ئەو خودایـەی هەرچـی لـەناو ئاسمانەکان و زەمیندان، گشت هی ئەون﴾ ابراهیم: ١،٢.

خوای گەورە گرەنتی داوە بەم ئوممەتە -کاتێك بەتەواوی بە داخوازیەکانی ئـەم دینە هەڵدەستێ- ئەوە جێگیرو جێنشین و دەسـەڵات و دڵنیایـان بکـات: ﴿ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا...: خوا بەوانـەی لـە ئێـوە بڕوایـان هەیـە و ئاکار چاکن، بەڵێنی دا: لـەم زەمینـە دەیانکاتـە جێگـە نـشین؛ هـەروەکو چـۆن ئەوانەی بەر لەوانی کردە جێ نشین. دینەکەشیان -کـە خـۆی پەسـەندی کـردوە- هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بـۆ دەکاتـە دڵنیـایی }تـا{ تـەنیا مـن بپەرستن؛ هیچ شتێکیش بەشەریکی من نەزانن﴾ نور: ٥٥.

ئەم جێنشینی و دەسەڵاتداریە ماوەی چەند سەدەیەك بـۆ ئـەم ئوممەتـە هاتـە دی، کە تیایدا ئوممەتی ئیسلام، لە هەموو لایەنەکان باشترین ئوممەت بـوو لەسـەر ڕووی زەوی، لە لایەنی بیروباوەڕ(العقيدة ) لە لایەنی ئەخلاق و فکر و سیاسەت و جەنگ و ئابوری و شارستانیەت.. لە هەموو بوارێکی ژیاندا توانی ببێتە باشترین ئوممەت، لەو کاتەی ئەوروپا لە تاریکیەکان نقوم ببوو، کە خۆیان ناوی: سەدەکانی ناوەندی ( القرون الوسطى )ی بە سەردا دەدەن.

بۆ ئەو ئوممەتە سەروەری و هێز و بەرگری هاتەدی. بۆ یەکەم جار لـە مێـژوودا مانا و چەمکی نەتەوە(امـة) هاتەدی، کە توانی چەند گەلێکی جیاواز لە ڕەگەز و زمان بگرێتە باوەش، کە ئەوانـە هـەموویان پێکـەوە یەکبەسـت بـوون بـە تاکـە

پەتێك، كە ئەویش ئیسلامە. ئەگەر چی با نێوانی شوێنیان لێك دوور بێ، با پەیوەندی نێوان كار بەدەستەكانیان جیاوازی هەبێ، بەڵام پەتی ئیسلام، كە دڵەكان و هەستەكان یەك دەخات، لە دەروونیان زۆر بەهێزترە لە هەر شتێك، كە ببێتە مایەی پەرتەوازەیی و جیاڕایی. ئەوانە هەر لە ئیسلام عەقیدەكەیان وەردەگرن، هەر لەو شێوازی گوزەرانی ژیانیان وەردەگرن، هەر لەو ئەخلاق و هەڵس و كەوت وئاراستە گشتییەكان وەردەگرن، لە گەڵ ئەوەی، كە هەموو گەلێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، هەموو تاكێكیش تایبەتمەندی خۆی هەیە.

لە ماوەی ئەم چەند سەدەیەدا، لەلایەنی ئابوورییەوە خۆشگوزەرانیەكی فراوان بۆ ئەم ئوممەتە هاتنە دی، كە سەرچاوەكەی هەوڵ دانی موسوڵمانان بوو لە هەموو كون و كەلەبەرەكانی زەوی، كە ڕوناكیان تێدا بڵاو دەكردەوە، شتە نادیارەكانیان ئاشكرا دەكرد و، ئاوەدانیان دەكردەوە، بۆ ئەوەی ئەو ئاراستە خواییە جێبەجێ بكەن.

﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ: ئەو كە، ئەو زەمینەی بۆ كەوی كردون، شانەو شان تێیدا بگەڕێن و لە بژێوەكەی بخۆن. هەستانەوەش بۆ لای ئەوە﴾ ملك: ١٥.

﴿...هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ...: ئەو لەو خاكەی وەدی هێناون و ویستی ئاوەدانی بكەن﴾ هود: ٦١.

هەروەها چالاكیەكی زۆر لە لایەنی فیكری و عەقڵی و زانستی بۆ هاتەدی، كە لەوەو پێش بە خۆیەوە نەبینیوە، كە بەرهەمی ئەم سەدانە –سەددی دەسەڵاتداری- پێ‌هەڵدەستێنێ، لە زۆر ئاراستەی لێك جیاوازدا: چ لە فیقھ و

ئوسولّدا، له مێژوودا، له پزیشکی و گەردونناسی و بیرکاری، له گەشتیاری و دۆزینەوەی جوگرافیدا، بەڵکو له هەموو لایەك له لایەنەکانی ژیانی هەڵقوڵاو پڕ خێردا، زۆر شەیدای زانین زۆر شەیدای دامەزراندنی خیلافەتێکی راشید بوون لەسەر ئەم زەمینەدا: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً... : ئەو کاتەی پەروەردگاری تۆ بە فریشتانی ڕاگەیاند: من دەمەوێ بریکارێك لەسەر زەمین دیاری بکەم﴾ بقرة:٣٠.

هەروەها بوونی شارستانیەتەکی بەر فراوانی بۆ هاتە دی، کە تەنها کورت هەڵنەهێنرا بوو لە وەبەرهێنانی ماددی و شارستانیەتی ماددی، له دروست کردنی شار و باڵەخانە و ڕێگاوبان، هەروەها هونەری بەڕێوەبردن.. بەڵکو توانی مانای گەوهەری شارستانیەت بێنێتە دی، یانی بڵند کردن و بەرزکردنی مرۆڤ بۆ ئەوەی شایەنی ڕێزلێنانی خوا بێت: بەرز بوونەوەی بە عەقیدە، بەرز بوونەوەی بە ئەخلاق و هەڵس و کەوت و فیکر و زانین، کە چالاکی ماددی له هەموو ئەمانە سەرچاوە دەگرێ و لێ ی کورت هەڵنانرێ.

هەروەها یەکەم ئوممەت بوو کە خوێندن و چارەسەرکردنی بە خۆڕایی بێنێتە کایەوە، کە لەسەر ئەم دوو خزمەت گوزاریە چەند پارە و پولێکی زۆری تەرخان کرد، لەسەر بودجەی دەوڵەت نەدەوەستا، کە هەیەتی یان نیەتی، گرنگی پێدەدات یان گرنگی پێنادات، ئەوەندەی بەلاوە گرنگ بوو پاڵنەری خێر بێ لە دەروونەکان و پاڵنەری بەخشینی بێ سنوریان بێ.

هەروەها یەکەم ئوممەت بوو-یان تاکە ئوممەت بوو- چەند خانویەك بۆ پەککەوتوەکان ( العجزة ) دروست بکات بۆ سەرپەرشتی کردنیان، هەروەها چەند

تەوێلەیەك دروست بكات بۆ حەوانەوەی ئەو گیانلەبەرانەی، کـە بـزر بووینـە بـۆ ئەوەی سەرپەرشتی بکرێن و ئالیك بدرێن!

هەروەها یەکەمین ئوممەت بوو -یان تاکە ئوممـەت بـوو- کـە وەفـاو ئەمـەکی دەنواند بەرامبەر بەو بەڵێن و پەیمانانەی کە لەگەڵ خەڵکانی تر گرێـی دەدا، پێـی پەیوەست دەبوو، نەك لەکاتی تەنگانە و پێویستی جێبەجێی بکات، بەڵام ئەگەر هەلێکی بۆ ڕەخسا هەڵی بوەشێنێتەوە!

هەروا ئوممەتە یەکەم ئوممەت بوو -یان تاکە ئوممەت بوو- کە خەڵکانی جیـاواز لە عەقیدە و بیرو بۆچونی نەدەچەوساندەوە، بەڵکو ئاگای لێ دەبـوون و بـوارێکی پـڕ ئـەمن و ئاسایـشی بـۆ سـاز دەکـردن بـۆ ئـەوەی بـە ئازادیـەوە، بـیروڕا و پەرستنەکانیان ئەنجام بدەن، لە گەڵ چالاکیە ئابوری یەکانی ژیانیان، بە مـەرجێك ئەگەر شەڕانگێز نەبن و ئاشکرای شەڕانگێزیەکان نەکەن!

بە کورتی.. تاکە ئوممەتی شارستانی بوو..

* * *

بەڵام وەرچەرخانێکی زۆر گەورە لە مێژوو ڕوویدا!

دیارە ئەمەش لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا ڕووی نەدا.. چـونکە هـیچ شـتێك لـە نێوان شەو و ڕۆژێکدا ڕوونادات، مەگەر قەزا و قـەدەری لـە ئاسـا بـەدەری خـوا نەبێت! بەڵکو هەتا کودەتای سەربازیش لە نێـوان شـەو و ڕۆژێکـدا لـە چـەرخی ((ڕووناکیدەر!!)) کە ئەمڕۆ تیایدا دەژین، ڕونادات، بـەڵکو کـاتێکی دەوێـت بـۆ بیرکردنەوەو خۆ ئامادەباشی، پێش ئەوەی لە گۆڕەپانی واقیعدا بۆ خەڵکی ببێتـە

شتێکی ناکاو..

وەرچەرخانەکە لە میانەی چەند سەدەیەك ڕویدا.

وردە وردە.. ڕووبەری (( دین )) لە دەروونەکان بەرەو داکشان چوو.

ئەم دینە بۆ ئەوە هاتە خوار، تا هەموو لایەنـەکی ژیـان بگرێتـەوە، نـەك بـە تەنها لایەنێك بگرێت و بەس، با ئەو لایەنە هەرچەندە گـەورە و گـرنگ بێـت: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ...: بلـێ: من نوێژ کردنم و پێك هێنانی ڕێو شوێنی حەج کردنم و ژین و مەرگم، بۆ خودایە، کە ڕاهێنەری دنیایە هەر خۆیەتی. کە هیچ هاوتای نیە﴾ أنعام: ١٦٢،١٦٣.

بڕوا بە خوای تاك و بێ هاوتا، گرنگ ترین شتە لە ژیانی مرۆڤدا. گرنگ ترین و بەنرخترین شتە لەوەی لە ژیان دا هەیە، بەڵام کاتێك ئەو بڕوایـە هـەر لـەناخی ویژدان بێت و تریسکاییەکەی نەگاتە سەر ڕووبەری لایەنەکانی ژیانی جۆراو جـۆر، نابێتە ئەو ئایینەی کە خوای گەورە ڕەوانەی کردوە، کە فەرمانی کـردوە شـوێنی بکەوین و سزای داناوە، کە وازی لێ بهێنین، پاداشتیشی داناوە بۆمان کە جێ بـە جێی بکەین!

دینی خوا ئەوەیە، ((لە دڵ جێگیر ببێ و بە کردەوەش پشت ڕاسـتی بکـات)) خوای گەورە تەنها داوای لە خەڵك نەکردوە لە ناخی ویژدانیاندا بڕوای پێ بهێـنن، کە یەکە و لە کەس پەیدانەبوە و، کەسیشی لێ پەیدا نابێ و کەسیش وەکـو ئـەو نابێ... ئەگەر چی ئەمە بنچینەیە، کـە دەبـێ هـەموو شـتێکی لەسـەر بنیـات بنرێ... بەڵکو خوای باڵا دەست داوای لە خـەڵکی کـردوە، کـە یەکخواپەرسـتی بچێتە هەموو کون و کەلەبەرەکانی ژیانیان، بەوەی، کە فەرمانەکانی جێ بە جـێ

بکەن و واز لە قەدەغەکراوەکانی بهێنن و، پابەند بن بەو شەریعەتەی، کە ناردویتە خوارەوە.. چونکە هەر لادانێك لەو ڕێگایە، یان پێچەوانە کردنی دەبێتە کەم بوونەوەی بڕوا، کە هەم کار لە تەرازوو(میزان) و لە ئەنجام دەکات. بڕوایش - هەروەکو زانایانمان دەفەرمون- زیاد دەکاو کەم دەکا. زیاد دەکات بە گوێڕایەڵی بۆ فەرمانی خوا و، بە سەرپێچی کردنی کەم دەکات.

بێگومان پلەکانی کەمی بڕوا بە گۆرینی جۆری لادانەکەو بارستایی سەرپێچیەکە دەگۆڕێت، ئەگەر چی بنچینەی بڕوا هەڵناوەشێتەوە، مەگەر کردەوەیەك لە مرۆڤ ڕوبدات، کە بڕوای پێ هەڵدەوەشاوە. ئەو کردەوانەی، کە دەقی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر و کۆ ڕای زانایانی لەسەر بوو، وەك جنێودان بە خواو پێغەمبەرەکەی، یان کڕنوش بردن بۆ بت، یان سوك کردنی قورئانی پیرۆز، یان حوکم کردن جگە لە شەریعەتی خوا.. ئەوە ئەگەر لەو کردەوانە بوو ئەوە باوەڕەکە هەموو هەڵدەوەشێتەوە.

ئەم دینە لە واقعی ئەم زەمینەدا کاری پێ دەکرێ و بەروبومەکەی دەدا، بە ئەندازەی ئەوەی خەڵکی پێوە پابەند دەبن و دەقەکانی جێبەجێ دەکەن، بەڵام ئەگەر پابەند نەبوون و دەقەکانیان ئەنجام نەداو پەیڕەوی نەبون، ئەوا ئەو دینە لە دەروونی خەڵکیدا گۆشەگیر دەبێت، هەروەها بەروبومەکەشی بە ئەندازەی ئەوەی کە لادان و سەرپێچی ڕوو دەدات تەسك دەبێتەوە.

لەم بارەیەوە ئایەتی زۆر هەن کە زۆر ڕون و ئاشکرانە -هەروەکو لە هەمو شتێك دا ڕون و ئاشکرانە: ﴿ ثُمَّ أَوْرَثْنَا الْكِتَابَ الَّذِينَ اصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ بِإِذْنِ اللَّهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَضْلُ

الْكَبِيرُ: جا ئەوسا ئەو كتێبەمان كردە میرات بۆ ئەو عەبدانەمان كە هەڵمان بژاردن. لە ناو ئەوانیشدا كەسانێك هەن غەدرێ لە خۆ دەكەن؛ برێكیشیان مام ناوەنجین. هەر لەوانیش كەسانێك هەن _ بە ئیزنی خوا _ سەبارەت بەكاری چاكە پێشە برِی لە هەوالاَن دەبرِنەوە؛ كە ئەمە زێدە بەشێكی زۆر هێژایە﴾ فاطر:٣٢.

هەموو ئەمانە برِوادارن، هەریەكە بە ئەندازەی باوەرِی چاكە و گەورەیی و بەزەیی و رِەزامەندی خوای بەركەوتوە، بێئەوەی بنچینەی برِوایەكەیان هەڵبوەشێتەوە.. بەلاَم ئەمانە نەخێر: ﴿ وَيَقُولُونَ آمَنَّا بِاللَّهِ وَبِالرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّى فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّن بَعْدِ ذَلِكَ وَمَا أُوْلَئِكَ بِالْمُؤْمِنِينَ، وَإِذَا دُعُوا إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ: ئەشلێن ئێمە باوەرِیمان هێناوە بەخواو پێغەمبەر هێناوە و بەرفەرمانین لە دوای ئەوەش برێكیان رِوو وەردەگێرِن، ئەوانە هەر برِوادار نین. هەر هەنگاوێكیش بەرەو خودا و رِاسپاردەی بانگیان دەكەن، كە خۆی بەكاریان رِابگا، كەچی دەستەیەكیان هەر خۆی لێ دەبوێرن﴾ نور: ٤٨،٤٧.

﴿ فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا: بەلاَم نەخێر سوێندەكە بە پەروەرندەی تۆ، ئەوانە نابنە خاوەنی برِوا، مەگەر وەختێ لە كێشەو هەرای نێوان خۆیانا بتكەنە قازی و لە دڵەوە بەهەر فرمانێ تۆ بیدەی رِەوایان بێ و بەتەواوی مل كەچی بن﴾ نساء: ٦٥.

* * *

ئەمە رِاستی و دروستی ئەو دینەیە، كە خوای گەورە ناردویتە خوارەوە و، پێغەمبەرﷺ فێری هاوەڵەكانی كردوە، هەروەها وەكو كە نەوەكانی یەكەم لە

موسولّمانان تێی گەیشتون.

هەر بۆیە کە سەیری فیکری ( ئیرجاء ) دەکەی، کە تێکەڵ بە ژیانی موسولّمانان بوو، فکرەیەکی زۆر غەریب و نامۆ بوو لەو ئیسلامەی کە خوای پەروەردگار رەوانەی کردووە، ئەو فکرەی کە کردەوەی لەئیمان دەهێنێتە دەرێ ، بەڵکو لە پێویستیەکانی باوەڕیشی نە ئەژمارد، ئەم فکرەیە دەڵێ: ئەو کەسەی بڵێ (لا اله الا الله) ئەوە بڕوادارە، ئەگەرچی هیچ کردەوەیەکیش لە کردەوەکانی ئیسلام ئەنجام نەدا، هەروا دەڵێ: (( ئیمان بریتیە بەڕاست زانین و دان پێداهێنان، کردەوەش ناچێتە ناو (مسمی) ی ئیمان))، ( (مسمی) ناو نیە هەروەکو هەندێك خەڵك وای بۆ دەچن، بەڵکو دەرکەوتنی ڕاستی ئەو شتەیە، کە ناوەکەی بەسەردا دراوە، هەر لەو بارەیەش وتراوە: ( اسم علی مسمی، ناوێك دراوەتە سەر (مسمی)کەی. واتە ناوێکە وەسفەکەی راستە بۆ وەسف کراو).

بەڵێ! ئەم فکرە زۆر نامۆیە بەم ئیسلامە، کیتابی خوا کە ناردویتە خوارەوە، سەدەها جار نمونەی ئەو ئایەتانەی دابەزاندوە، کە دەفەرموێ: ﴿ الذین آمنوا وعملو الصالحات: ئەوانەی بڕوا دێنن و کردەوەی چاکەش دەکەن﴾ نمونەی تری وەکو ئەم ئایەتانەش زۆری دابەزاندوە: ﴿...وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا، مَاكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا: مژدە بدا بە خاوەن ئەو بڕوادارانەی ئاکار چاکن، یا پاداشتی باشیان دەبێ هەتا هەتایی لەوێ دەمێننەوە﴾ کهف: ٣،٢.

﴿ إِنَّ هَذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا: بێگومان ئەم قورئانە رێگایەکی پیشان دەدا لە

گشت ڕێیان سەر ڕاسترە. بەو بڕوادارانەش ئاکار چاکن، موژدە دەدا: پاداشتێکی گەورەیان هەیە﴾ اسراء: ٩.

﴿...فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا: هەریەکێ لەنگۆ بۆ دیداری پەروەرندەی بە ئاواتە، با کاری چاك ڕەچاو بکاو لە جگە پەروەرندەی خۆی هیچ کەسێکی نەپەرستێ﴾ کهف: ١١٠.

﴿ وَمَا أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُم بِالَّتِي تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَى إِلَّا مَنْ آمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا فَأُوْلَئِكَ لَهُمْ جَزَاء الضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا وَهُمْ فِي الْغُرُفَاتِ آمِنُونَ: ماڵ و منداڵتان لەوانە نین لە ئێمەو نزیك کاتەوە، مەگین کەسێ بڕوای بە ئێمە هێنابێ و ئاکاری چاك ڕەچاو بکا، کە لەبەرامبەر کردەیان دوو سەرە پاداشت وەردەگرن و بێ دەغدەغە لە غورفەکانی بەهەشتا دەسێنەوە﴾ سبأ: ٣٧.

هەروەها فیکری (صۆفی)ش زۆر نامۆیە بەو ئیسلامەی، کە خوای گەورە ناردویەتە خوارەوە، ئەو فکرەی پەرستنی خوا گۆشەگیر دەکات لە شادی ڕۆح و زیکرکردن، شێخیش لە هۆش و بیری موریدان زۆر گەورە دەکات، هەتا وای لێدێت دەبێتە ناوەند(وسیط)ێك لە نێوان بەندە و خوا، بەڵام ئیسلام هەموو هۆ و ناوەندێك لە نێوان خودا و بەندە لا دەبات، پەرستنیش لە هەموو ژیانی مرۆڤ گشتگیر دەکات، جیهادیش دەکاتە لوتکەی هەرە بەرزی ئیسلام: ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُواْ لِي وَلْيُؤْمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ: ئەگەر عەبدەکانم لەمەڕ من لەتۆ دەپرسن، من نزیکم؛ هەرکەس هانام وەبەر بێنێ، بێ وەرامی ناهێڵمەوە، بەڵکو ڕێی ڕاست بەدی بکەن﴾ بقرة: ١٨٦.

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ...: پەروەرندەتان گوتویە: لەبەرم بپارێنەوە، ئەوسا بەدەنگتانەوە دێم ﴾ غافر: ٦٠.

﴿ قُلْ إِنَّ صَلاَتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ، لاَ شَرِيكَ لَهُ...: بڵێ من نوێژکردنم و پێك هێنانی ڕێوشوێنی حەج کردنم و ژین و مەرگم بۆ خودایە، کە ڕاهێنەری دونیا هەر خۆیەتی، کە هیچ هاوتای نیە ﴾ أنعام: ١٦٢،١٦٣

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَى تِجَارَةٍ تُنجِيكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ، تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ، يَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَيُدْخِلْكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ ذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! دەتانەوێ مامەلەیەکتان پێ بێژم، کە لە ئازارێکی بەژان ڕزگاروکا. بڕوا و بە خوا و بە پێغەمبەری ئەو بێنن و دارایی و گیانی خۆتان لە ڕای خودا تێ بکۆشن؛ ئەمە بۆ ئێوە باشترە گەر بیزانن لە گوناهانو دەبورێ و دەتان باتە ناو باغاتێك جۆ باریان بە بەردا دەڕواو خانوی زۆر خۆش و خاوێنتان لە بەهەشتی هەمیشەییدا دەداتێ؛ ئەمە دەسکەوتی گەورەیە﴾ صف: ١٠،١١،١٢

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی : ﴿ ألا أخبركم برأس الامر، و عموده، وذروة سنامه؟ ئایا پێت ڕانەگەیەنم، کە سەری ئەم کارە و کۆڵەکەکەی و لوتکەکەی چیە؟ ))، -مەعازی کوڕی جەبەل دەڵێ- وتم: بەڵێ ئەی نێرراوی خوا، فەرمووی: (( رأس الامر الاسلام، و عموده الصلاة، وذروة سنامه الجهاد: سەری کارەکە

ئیسلامە، کۆڵەکەکەی نوێژە، لوتکەکەی جیهادە﴾[1]

هەروەها تەسک کردنی ئیسلام لە چوارچێوەی تاك و لەکارخستنی ئەرکبار(تکالیف)ەکانی بە کۆمەڵ و کۆمەڵایەتی و سیاسی و فەرمان بە چاکە کردن و قەدەغە کردن لە خراپە کردن، ئەمەش بیرۆکەیەکە نامۆ بەو ئیسلامەی خودا ناردیەتیە خوارەوە، چونکە خودا ئەو ئەرکانەی هەموو فەرز کردوە هەروەکو، کە ئەرکەکانی تاکیشی فەرز کردوە، ئەگەر چی هەندێکی لەو ئەرکانە کردۆتە فەرزی کیفایە، نەك فەرزی عەین، بەڵام ئەگەر کەسێك نەبوو ئەو ئەرکانە جێ بەجێ بکات، ئوممەت هەموو گوناهبار دەبێت.

هەروەها پشت لێکردنەوە و گرنگی نەدان بە گرتنی هۆیەکان ( الاخذ بالاسباب ) بە هەنجەتی پشت بەستن بە خودا، ئەمەش نامۆیە بەو ئیسلامەی کە خوا ناردویەتیە خوار، کە فەرمان دەکات بە پشت بەستن بە خودا و لەگەڵیشیدا فەرمان دەکات بەگرتنی هۆیەکان ( الاخذ بالاسباب ): ﴿ ...فَإِذَا عَزَمْتَ[2] فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ...: وەختێ لێ بڕای کارێ بکەی، هەر بەتەمای خوا تێکەوە﴾ ال عمران: ١٥٩.

﴿ وَلاَ يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُواْ إِنَّهُمْ لاَ يُعْجِزُونَ، وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ وَآخَرِينَ مِن دُونِهِمْ لاَ تَعْلَمُونَهُمُ اللّهُ يَعْلَمُهُمْ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فِي سَبِيلِ اللّهِ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لاَ تُظْلَمُونَ: خوا نەناسان وابیر نەبەن، کە پێش کەوتون، ئەوان ئێمە نابەزێنن. تا

---

[1] / اخرجه الترمزی.

[2] / عەزیمە بە تەنها نیەت نیە، بەلکو خۆ ئامادە کردن بۆ بەجێهێنانی نیەتەکە دەگرێتەوە.

بۆت دەكرێ چەك و جبە خانەی شەڕ و ئەسپی سواری پەیدا بكـەن، دوژمنـی پـێ بترسێنن، كە دوژمنانی خوداشن. غەیری وانیش دوژمنو هەن نایان ناسـن، بـەڵام خودا دەیانناسێ. هەر ماڵێكی لە ڕاهی خودای بەخت كەن خـودا دەیبژێرێتـەوە و هیچ ناهەقیو لێ ناكرێ﴾ أنفال: ٦٠،٥٩.

﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِـهِ وَإِلَيْـهِ النُّشُورُ: ئەو، كە ئەو زەمینەی بۆ كەوی كردون، شانەو شان تێیـدا بگـەڕێن و لـە بژێوەكەی بخۆن، هەستانەوەش بۆ لای ئەوە﴾ التبارك: ١٥.

هەروەها لێك دابڕان لە نێـوان كـردەوە بـۆ دونیـاو، كـردەوە بـۆ ڕۆژی دوایـی نامۆیە بەو ئیسلامەی خوا ناردویەتیە خوار، خـوای گـەورە دەفـەرموێ: ﴿ وَابْتَـغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا...: بەوەی خودا بـە تـۆی داوە، بە شوێن ماڵی سەڵاوەبە! بەشـی خۆشـت لـەم دونیایـە لـەبیر مەكـە...﴾ قصص: ٧٧.

بەڵام ئەم دەردو نەخۆشیانە، وردەوردە لەناو ئەو ئوممەتـە پەیـدا بـوو، پاشـان هەموو ڕۆژ قەبارەكە و كارتێكردنەكەی زیادی دەكـرد، بـەبێ ئـەوەی چارەسـەری بكرێ.

ناڵێین چارەسەر هەر نەبوو، چونكە ئەمـە سـتەمە لـە مێـژوو، چـونكە هـیچ سەدەیەك و چەرخێك تێنەپەریوە بەسەر موسوڵمانان، كـە هـیچ چاكسـاز و پیـاو باشی لە ناو نەبێت. بەڵكو دەڵێین: بزووتنەوەی چاكسازی وەك پێویـست نـەبووە، لە كاتێكدا نەخۆشیەكان بەردەوام هەموو ڕۆژ زیادی دەكرد.

* * *

بەڵام کاتێك ئیسلام لە دڵی خەڵك کزبوو -مەگەر ئەوەی خوا بەزەیی پێداهاتبێتەوە- تیشکدانەوەشی لە جیهانی واقیعدا کزبوو.. ئەو تیشکدانەوەیەی بە سەر جیهانی واقیعدا رەنگ دەداتەوە، سەرچاوەکەی ئەو رووناکیەیە، کە لە دڵەکان هەڵدەقوڵێ، جا بە ئەندازەی هێزی ئەم رووناکیە، یان کزیەکەی رووناکی یان تاریکایی دێتە کایەوە، ئەمەش بە گوێرەی سوننەتی خوا، کە هەرگیز دواناکەوێ و لاگیری کەس ناکات و موجامەلەی هیچ کەسێك ناکات، کە بە قسە بیڵێ، بەڵام لە جیهانی واقعیدا کاری پێ نەکات:

﴿... فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا: ئەمە رێگەو شوێنی خوایە و، قەت نابینی رێ و شوێنی خوا بگۆڕدرێ و جێگۆر بێ﴾ فاطر:٤٣ .

﴿ لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ وَلاَ يَجِدْ لَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَلِيًّا وَلاَ نَصِيرًا: نە بەئاواتی ئێوەیە و نە بەهەواو ئارەزووی ئەو کەسانەیە کە بە ئەهلی کتێب حسێبن. هەر مرۆیەك کارێکی نالەبار بکات، بەو کارەی خۆی جەزا دەدرێ و جیا لەخوا هیچ کەسی بۆ پەیدا نابێ دۆستی بێ و وە هاواری بێت.﴾ نساء: ١٢٣.

پاشان ئەم ئوممەتە پەیتا پەیتا دەچوە ناو تاریکی: تاریکی نەفامی.. تاریکی بێ دەسەڵاتی.. تاریکی دواکەوتن.. تاریکی نەداری و هەژاری.. تاریکی بەستان(الجمود).. تاریکی کزی و هیلاکی.

ئەمە وەنەبێ بەهۆی (دین)ەوە بێ، هەروەکو زەین کوێرەکان گومان دەبەن، کە

غەزوی فکری، هۆشی نەهێشتون.. نەخێر بەڵکو -هەروەکو کە ڕوونە- بەهۆی دورخستنەوەی لەسەرخۆ و پلەپلەیە بوو لە ڕاستی و دروستی دیندا.

* * *

لەوکاتەی ئەو ئوممەتە ئیسلامیە دەستی کرد بە بێ هێزی و وێکهاتن و کزبون، هەر لەو کاتەدا ئەوروپا دەستی کرد بە سەرهەڵدان و پێشکەوتن و فراوان بوون، لەهەموو ئەو لایەنانەی، کە بوونی ئیسلامی تیادا بەرەو کزیی چوو بوو!

لەو بارو دۆخەدا چەند جیاوازیەك بەدی کرا، -کە لە سەرەتادا نامۆ بوو-، بەڵام زۆر مەنتیقی و بەجێیە، ئەگەر بە سەر سونەتەکانی خوا و بەسەر بەڵێن و هەڕەشەکانی دا بخەینەڕوو.

ڕاپەڕینی ئەوروپا -نزیکەی هەمووی- پشتی چەند بنچینەیەکی ئیسلامی بەستووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستی ئەوروپا بەرانبەر ئیسلام، هەڵوێستێکی نکوڵیکەری و کینەدارە و پڵنگ ئاست خۆی مەڵاس دەدا بۆ پەلامار دان و هەڵکوتانە سەر!

ئەوروپا لەناو سەدە تاریکەکانی ناوەڕاست دەرباز بوو، بەهۆی ئەو ڕۆشناییەی، کە لە زانست و هونەر و شارستانیەتی موسوڵمانان وەری گرت، بەڵام لە هەمان کاتدا دژی ئیسلام و موسوڵمانانە. ئەم کاردانەوەیە لەم جۆرە هەڵوێستەدا لەخۆوە نیە، یان سروشتی نیە.

ئەوروپا نزیکەی ( دە سەدە ) لەناو سەدە تاریکەکانی ناوەڕاست مایەوە، لەو ماوەیە دووروو درێژەدا هەستی نەدەکرد، کە لەناو تاریکاییدا دەژی! بەڵکو هەستی بە تاریکیش نەدەکرد، ئارەزووی دەرچونیشی نەدەکرد، هەتا ئەو کاتەی

ڕوناکی دیت! ئەویش ڕوناکی ئیسلامە!

ئەو ئەوروپایەی، کە ئیسلام لە -تاریکایی دەرهێنا بەرەو ڕوناکی- لەسێ ڕێگاوە ئاشنایەتی لەگەڵ ئیسلام دا پەیدا کرد. یەکەمیان: جەنگی خاچ پەرستەکان، کە ئەوروپاییەکانی ئاگادار کرد لە چەند وڵات و شوێنێك، کە ژیانێکی زۆر جیاواز لە هەموو بوارو لایەنەکان لەچاو ژیانی ئەوان دەبەنە سەر، دووەمیان: ئەو پەیوەندیە بازرگانیەی کە شاری ( جنوة ) و ( بندقیة ) و جگە لەوانەش لەگەڵ جیهانی ئیسلامی بەستایان، سێ یەم: لە ڕێگای ئەو نێردراوە زانستیانەی، کە ئەوروپا دەیان ناردن بۆ قوتابخانە ئیسلامیەکان لە ( اندلس ) و (صقیلة)ی ئیسلامی، یان لە وڵاتی موسوڵمانانی تریش، جا کاتێك ئەو نێردراوانە بە شەیدایی و هۆگرییەکی زۆر بە ژیاری ئیسلامی و زانستی ئیسلامی و فکری ئیسلامی گەڕانەوە..

ئەوروپا -بەو کارتێکردنانە- نزیك بوو بێتە ناو ئیسلام هەروەکو، کە مێژونوسی بەریتانی ( ویلز ) لە کتێبی ( معالم تأریخ الانسانیة )[1] گوتویەتی، هەروا مێژونوسان و نوسەری تری ڕۆژئاواش ئەم ڕاستیەیان درکاندووە[2] .

لێرەدا کلێسەی ئەوروپی شێت بوو، هەستان بە دژایەتی کردنی دەسەڵاتی ئیسلامی زۆر بە توندی و دڕندەیی لە ڕێگای دادگاکانی پشکنین ( محاکم التفتیش) لە لایەك، لە لایەکی تریش شاعیر و نوسەرەکانی ڕاسپارد، کە وێنەی

---

1 / ب٣ ل٩٦٦، گۆرینی بۆ عەرەبی (( عبد العزیز تۆفیق جاویر )).

2 / بۆ نمونە تەماشای کتێبی ( شمس الله علی الغرب ) بکە ، دانەرەکەی ( زیجر ید هونکة).

ئیسلام لە دەرونی ئەوروپیەکان بشێوێنن و، تانەو تەشەری کەم و کوڕی تێ بگرن، بۆ ئەوەی هەر کەسێك ئارەزوی لە ئیسلامە و، شارستانیەت و زانست و هزر و بیری ئیسلامی کاری تێ کردونە، نەچنە ناویەوەو لێ ی ڕابکەن.

پێویستە بزانین -بە تایبەت ئێمەی موسوڵمان-، کە ( جوردانو برنو ) بە زیندویی سوتێنراو هەڕەشە لە ( کوپرنیکوس ) و ( گالیلو ) کرا، کە بە زیندویی بیان سوتێنن، چونکە ئەوانە خۆیان خستبوە سەر هزرێکی زانستی ( افکار علمیة)، کە لە زانایە موسوڵمانەکان وەریان گرتبو. ئەنجا ئەوەی سوتێنرا سوتێنرا. هەرەشە کردن لەوانی تر بە سوتاندنیان، ئەوە هەر خۆی لە خۆیدا هەڵوێستێکی خاچپەرستی بوو، هەر لە سەرەتاوە و توندوتیژیەکی دڕندانە بوو هەروەکو مۆرك و خەسڵەتی جەنگە خاچپەرستیەکان بووە لە سەرەتای مێژووەوە هەتا ئەو سات و کاتە، کە چەند دیمەنێکیمان لێ لە بۆسنە و هێرسك و کۆسۆڤاو شیشان ( لە چەرخی دیموکراتیەت و ئازادی و ڕێزلێنانی ( بەرامبەر!! )) دیت. ئەگەر چی سەرچاوە ئەوروپیەکان بە هیچ شێوەیەك ئاماژە بەو ڕاستیە ناکەن.

بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئێمە رونی بکەینەوە ئەوەیە، کە لە ئەنجامی کردەوەکانی کلێسە، ئەوروپا کەوتە نێو تەنگژەیەکی گەورە، کە شوێنەوارەکەی ئاکامێکی خراپ بووە لەسەر هەموو مرۆڤایەتی. لەسنور لادانی کلێسە لە سەدەکانی ناوەڕاست ( کە ئەوروپا هەستی بەو سنور لادانە نەدەکرد، هەتا ئاشنایەتی لەگەڵ ئیسلام دا پەیدا نەکرد ) ئەنجامەکەی ئەوە بوو، کە ئەوروپا لە ئاینی کلێسە رابکاو یاخی لێ ی ببێ. زەبرو زەنگ بەکارهێنانیشی لە دژایەتی کردنی دەسەڵاتی ئیسلامی بە ئازاردان و شێواندن ئەنجامەکەی بووە هۆی ئەوەی،

کە ئەوروپا نەچێتە ناو ئیسلام و لیّ ی ڕابکا. جا ئەوروپا گەڕاوە سەر میراتی ئیغریقی ڕۆمانی بت پەرستی، کە لەمەوە هزرو بیروباوەرو بنەمای وەر دەگرت بۆ دژایەتی کردنێکی ئاشکرا لە گەڵ ئایین.

تا لێرەدا ئەو کارەساتە هاتەبوون، کە هەتا ئێستاش مرۆڤایەتی پێوەی دەناڵێنێ، ئەویش بوونی هێزێکی ماددی و زانستی و ئابوری و تەکنەلۆژیایەکی زۆر، لەگەڵ دابەزینی لایەنی ڕۆحی و ڕەوشتی ئەوتۆ، کە هەرگیز مرۆڤایەتی لە مێژووی خۆیدا نەگەیشتۆتە ئەم ئاستە..

ئەم بارودۆخە -لەگەڵ ئەوەی کە نامۆیە- هیچ گرفتێک بۆ موسوڵمانی هۆشیار و هۆشمەند دروست ناکات، کە لە سونەتەکانی خوا تێدەگا، لە کیتابی خوا و سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەزانێ، کە چۆن کاروبارەکان تێدەپەڕن بەسەر واقعی مرۆڤدا، کە ئەم کارو بارانە لە ژێر کۆنترۆڵی ئەو سونەتانەدان، کەبە هیچ جۆرێك ناگۆردرێ و لاناچێ. ئەم بارودۆخە هیچ پەشێویەك دروست ناکات بۆ ئەوەی لە ئایینەکەی لابدات، چونکە ئەو کیتابی خوا دەخوێنێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ...: جا کاتێ ئەو هەموو ئامۆژگاریانە _ کە کراون _ لە بیرو چوو، هەموو دەرگای بەختەوەرین بۆ کردەوە﴾ انعام: ٤٤.

دەزانی، کە نە دژ یەکە نە نامۆیە، کە گەلێك هەبن کافر و خوا نەناس بن لەگەڵ ئەوەی دەرگای هەموو شتێکیان لە هێزی ماددی و زانستی و ئابوری و جەنگی و سیاسی بۆ کرابێتەوە، هەتا ئەو کاتەی خوای گەورە بە حیکمەت و

دانایی خۆی دەیەوێ: ﴿... حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ[1] أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ، فَقُطِعَ دَابِرُ الْقَوْمِ الَّذِينَ ظَلَمُواْ وَالْحَمْدُ لِلّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ: هەتا کەوتنە خۆشی و شادی، ئەوسا لە پڕ و نەکاوێك بەر تورەیی خۆمان خستن و هەموو ناهومێدمانەوە. ئیتر ئەوسا ئەو کەسانەی پیشەیان هەر ناهەقی بوو، دوابڕاو بوون و سوپاس بۆ خوای ڕاهێنەری هەموو دونیا﴾ انعام: ٤٤، ٤٥.

بەڵێ، ئەم بارودۆخە بە نیسبەت موسوڵمانی تێگەیشتو هیچ نامۆ نیە، کە پەی دەبات بە سونەتەکانی خوا. بەڵام دەبێتە فیتنەیەکی گەورە بۆ ئەو کەسەی پەی بەو سوننەتانە ناباو تێی ناگاو نازانێ حیکمەتەکەی چییە، چونکە ئەو بە جۆرێك بیری کردیتەوە، کە: ئەوروپا ڕۆژێك لە ڕۆژاندا دیندار بووە، لەگەڵ ئەوەی لە تاریکاییەکی تەواوادا دەژیاو نەفامی و بەستن ( جمود ) لە هەموو لایەك گەمارۆی دابوو، بەڵام کاتێك ئایینی فرێدا پێشکەوت و بوو بەشارستانی، چەند بازێکی زۆری هاوێشت لە هەموو بوارەکاندا! کەواتە.. ئاین برالەی تاریکی و پاشکەوتنە، بێدینی و کوفر و یاخی بوون لە ئاین، برالەی پێشکەوتن و شارستانیەت و بەرز بوونە!!

ئەمە چ ئاشوبێك و فیتنەیەکە بۆ ئەو کەسەی چاوی لە ئاست سوننەتەکانی خواو پەیبردن بە حیکمەتەکەی کوێر بو بێت؟!

بە ڕاستی لێرە جێگای پەرچ دانەوەی ئەو فیتنەیە نیە، چونکە لە جێگای تردا بەرپەرچمان داوە[2].

---

1 / واتە بە ترانی و غروری زاڵ بوو بە سەریاندا، لە سنور دەرچوون لەسەر زەوی بەناحەق.

2 / بۆ نمونە تەماشای ( قضیة التنویر فی العالم الاسلامی ) بکە.

زۆر گرنگە بۆمـان، کـە بەرپرسـیاریەتی ئوممـەتی ئیـسلامی ڕون بکەینـەوە، چونکە لە ڕاستیدا بە بەرپرسیاریەتەکەی گەورەو زەبەلاحە!

ئەگەر بهاتبا ئوممەتی ئیسلامی نەکەوتبا ناو ئـەو نەخۆشـیانەی، کـە لەمـەو پێش هەندێکمان باس کرد، ئەگەر بهاتبایە ئەو ئوممەتـە نەخۆشـیەکانی یـەك بـە یەك چارەسەر بکردباو لێ نەگەرابا ئەوها گەورەبێ و ئاڵۆز بێتـەوە هـەروەکو کـە ڕوویدا، ئەوا وێنەیەکی تر جگە لەو واقیعەی ئـەمڕۆ شـایەن و شایـستە بـوو بـە ویستی خوا لەسەر زەوی ڕوبدات.

ئەوروپا ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێز دەبوو بەوەی لە زانستی موسـوڵمانان فێـری ببـوو، پاشان بەو زیادانەی ڕۆژ بە ڕۆژ دەیخستە سەر زانیاری خـۆی لـە دەسـت پێکردنـە سەرەتاییەکانی، کە لە شکاندنی ئـەو کـۆت و زنجیرانـەی وەدەسـتی خـست، کـە کلێسە بە ناوی ئایین لە دەستی کردبوون، بەڵام ئەوروپا ئەوها بە هێـزو دەسـەڵاتە نەدەبوو بەو ئاستەی، کە ئەمڕۆ گەیشتۆتێ، چونکە ئەوان بەبێهێزی موسـوڵمانان گەیشتنە ئەو بەهێزیە، کاتێك ئەوروپای خاچ پەرسـت دەرچـوو -پـالی بـە خـاچ پەرستیەکەی خۆی نا- بۆ ئەوەی وڵاتـانی جیهـانی ئیـسلامی داگـیر بکـات، بـۆ ئەوەی سەرچاوەکانی بدزێت و سامانی خۆی چـەندە جـارە بکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی هەموو ڕۆژ لە هۆکارەکانی هێزی زیاد بکاو، بۆ زیاتر زاڵ بوون و کۆنترۆڵ کردن و بۆ زیاتر لە بردن و تاڵان کردنی سامانی موسوڵمانان. پاشان ئەوروپا نەدەبوە تاکە نمونەیەك بۆ بەهێزی و دەسەڵاتداری، نمونـەی یەکـەم بـڕوادارە و ئـەوەی تریـشیان کافرە، ئەو کاتە بۆ خەڵکی ئاسان و سانا بوو جیاکاری بکـەن لـە نێوانیانـدا بـۆ ئەوەی باشەکەیان هەڵبژێرن، نمونەی یەکـەم بـەهێزو جێگـرە لەسـەر زەوی، پـێش

کەوتوە، شارستانیە، خوێندەوارە، ڕۆشـنبیرە، چـالاکە، بەجووڵەیـە، بەرەکـەت و ئارامی لەهەموو لایەك دەوری داوە: ﴿ الَّذِينَ آمَنُواْ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِـذِكْرِ اللّـهِ أَلاَ بِذِكْرِ اللّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ: ئەو کەسانەی باوەڕیان بەخوا هەیەو بە یادی خوا دڵیـان ئارام دەبێتەوە، باش بزانن کە یادی خوا ئۆقرە و ئارامی دڵانە﴾ رعد: ٢٨. ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْـلَ الْقُـرَى آمَنُـواْ وَاتَّقَـواْ لَفَتَحْنَـا عَلَـيْهِم بَرَكَـاتٍ مِّـنَ الـسَّمَاء وَالأَرْضِ...: نیـشتەجێی ئـەم شـارانە ئەگـەر خوایـان بناسـیباو خـۆ پارێزبـان، دەروازەی بەرەکەتانمان لە ئاسمان و زەمینەوە بە ڕویاندا دەکردەوە﴾ اعراف: ٩٦.

نمونەکەی تریـان بـەهێز و دەسـەڵاتدارە، پـێش کـەوتوە لـە بـواری مـاددی و زانستی، بەڵام بێ بەشە لە خێر و بەرەکەت و ئـارامی، پڕیـەتی لـە دڵـەڕاوکێ و خۆکوشتن و شێت بوون و نەخۆشی دەروونی و سەر شێتی و سرکەرەکان و تـاوان.. نمونەی یەکەمیان -لەگەڵ ئەوەی کە بەهێز و دەسەڵاتدارە- هەوڵ نادات ستەم لـە خەڵکی بکات و سامان و قوت و زەخیرەیان تالان بکات و سەر شـۆر و زەبونیـان بکات، بەڵام نمونەکەی تر هێزێکی زۆردارە، کە واز ناهێنێ لـە دژایـەتی کـردن و زەبـون کردنـی خـەڵکی، ئـەم کـارەش تـەنها بـۆ ئـەوە دەکـات، کـە ئـارەزووی دەسەڵاتدارێتی تێربکات!

جا لەم کاتەدا فیتنەکە دروست نەدەبوو، یان با بڵـێین بەکـەمی فیتنەکـە بـەم جۆرە نەدەبوو، کە هەموو دونیا دابگرێ!

❊ ❊ ❊

بەڕاستی نەبوونی ئوممـەتی ئیـسلامی لـە گۆرەپـانی واقیـع، ئـەو کارەسـاتە ڕاستەقینەیە، کە تووشـی مرۆڤایـەتی هـات، چـونکە گۆڕەپـانی چـۆڵ کـرد لـە

نمونەیەکی ڕاست و دروستی شارستانیەتی مرۆڤایەتی و، دەرفـەتی بـە نمونەیـەکی خوار وخێچ دا، کە بەتەنها لە گۆڕەپانەکە بمێنێتەوە، بۆ ئەوەی ئـەو نمونـە خراپـە خەڵکی بە فیتنە ببات بەرامبەر بە خوایان و دواڕۆژیان و ئایینیان و ڕەوشـتیان و مرۆڤایەتیان!

هێنانە کایەوەی ئەم ئومەتە لەلایەن خوای پەروەردگارەوە بـۆ ئـەوە بـوو، کـە ڕێبەری هەموو خەڵکی بکات بۆ نمونەیەکی ڕاست و دروست!

﴿ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّـةً وَسَطًا لِّتَكُونُـواْ شُـهَدَاء عَلَـى النَّـاسِ وَيَكُـونَ الرَّسُـولُ عَلَيْكُمْ شَـهِيدًا...: بەو ئاوایە ئێمە ئێوەمان کردۆتە ئومەتێکی هەڵبژاردە تا ئاگاو لە مەردوم هەبێ و پێغەمبەریش چاوە دێریتان لێ بکا﴾ بقرة: ١٤٣. ﴿ كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللّهِ...: ئێـوە چاکترین کۆمەڵن لەناو مەردومی دونیادا سەرو هەڵدا، فەرمان بە چـاکە دەدەن و ڕێ لە ناڕەوا دەبەستن﴾ ال عمران: ١١٠.

کاتێـك ئـەو ئومەتـە بـە شـێوەیەکی راسـت و دروسـت بـە پێداویـستی و داخوازیەکانی ئەم پەیامە هەڵسا، توانی خەڵکێکی زۆر لە تاریکیەکان دەر بێنـێ بۆ ناو ڕوناکی. ئەنجا چ ئەوانەی باوەڕیان بە ئیسلام هێناو پابەنـد بـوون پێـوەی، یان ئەوانەی تەنها ڕوناکیەکەیان وەرگرت، بێ ئەوەی باوەڕی پێ بهێـنن هـەروەکو کە ئەوروپا وای کرد، کاتێك لە سەدە تاریکاییەکانی ناوەڕاست رزگاری بوو..

بەڵام ئەم ئومەتە کاتێك لە بەجێگەیاندنی پەیامەکەی کـەم تەرخـەمی کـرد، بەهۆی ئەو نەخۆشیانەی هاتە ڕێگای، هەلی ڕەخساند بۆ ( طاغوت ) بـۆ ئـەوەی دەسەڵاتی بسەپێنێ بەسەر خەڵکداو، دەریان بێنێ لە ڕوناکی بەرەو تاریکیـەکان:

﴿ اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُواْ يُخْرِجُهُم مِّنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّوُرِ وَالَّذِينَ كَفَرُواْ أَوْلِيَآؤُهُمُ الطَّاغُوتُ يُخْرِجُونَهُم مِّنَ النُّورِ إِلَى الظُّلُمَاتِ ...: خودا یاری گەلی خاوەن باوەڕانەو لەناو تاریکستانەوە دەیانبا بەرەو ڕوناکی دۆستی خودا نەناسانیش هەر تاغوتە، لە ڕۆشنی دەریان دەخەن بەرەو ڕوی تاریکستانیان بەڕێ دەکەن﴾ بقرة:٢٥٧.

* * *

بەلاّم ئەو كارەساتە گەورەی، كە تووشی مرۆڤایەتی هات لە ئەنجامی ئامادە نەبونی ئوممەتی ئیسلامی لە گۆڕەپانەكە ئەمە نەبوو، بەڵكو سەرهەڵدان و بەدیاركەوتنی جولەكەكان بوو، كە ئێستا خۆیان سەپاندوتە سەر هەموو مرۆڤایەتی.

ڕەنگە خوێنەر بەم گوتەیە توشی ناكاویەك بێت، یان پێی نامۆ بێت.. بەلاّم ئەمە زۆر -بە سادەو ساكاری- ڕوداوەكانی مێژون.

ئەو زاڵ بوونەی ئەمڕۆ، كە جولەكە هەیانە، كەی گەیشتە ئەو ئاستەی، كە ئەمڕۆ گەیشتۆتێ؟

لە وەلاّمدا دەڵێین: ئەم زاڵ بوونەیان لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆڕشی پیشەسازی دەستی پێ كرد..

شۆڕشی پیشەسازی لە سەرەتای هەڵگیرسانیدا پێویستی بە دوو توخمی سەرەكی هەبوو: یەكەمیان ئەو سامانە زۆرەی، كە بۆی هەیە كارگەكانی پێ دابمەزرێ، دووەم ئەو كۆمەڵە كرێكارەی، كە لە شارەكان هەبوون بۆ ئەوەی كاروباری كارگەكان هەڵسورێنن.

سەبارەت بە کرێکارەکان، ئەوان لە زەویە کشتوکاڵیەکان دەست بەسەر بوون، کە دەرەبەگەکان خاوەنی بوون، ئەم کرێکارانە بەندە بوون لەم زەویانە، نەیان دەتوانی بە ئارەزووی خۆیان بڕۆنە شار، بەڵکو نەیان دەتوانی لە زەوی دەرەبەگێك بچنە زەوی دەرەبەگێکی تر، مەگەر بە مۆڵەت نەبێت، ئەگینا بە بەندەی سەرپێچیکەر لە قەڵەم دەدران، پاشان بە دەم وچاو داغ کراوی دەیانگەڕاندنەوە بۆ زەوی خۆیان..

کەواتە بۆ ئەوەی شۆڕشی پیشەسازی بەو کرێکارانە کۆمەك بکرێ، دەبایە ئاغاو دەرەبەگایەتی لەناو ببردرێ..

جا شۆڕشی پیشەسازی ئەم کارەی ئەنجام دا، بەندەی زەوی(عبید الارض)ی ڕزگار کرد و ئازادی گواستنەوەو هاتوچۆی پێ بەخشین.

خەڵکی هەموو ئەوە دەزانێ، کە ڕۆڵی جولەکەکان چەند گرنگ بووە لە هەڵگیرسانی شۆڕشی فەرەنسی لە ڕێگای ئەو کۆمەڵە ماسۆنیانەی ئەو کات لە فەرەنسا بلاو بوو، ئەگەر چی جوولەکەکان دەڵێن ئێمە بووین شۆڕشی فەرەنسیمان دروست کرد، بەڵام ئەمە خۆ هەڵکێشانێکە دوورە لە واقیع، چونکە ئەگەر ئەو ڕق و قینە شاراوە نەبوایە، کەخر ببوەوە سەریەك لە میانەی چەند سەدەیەك بەهۆی ستەمی ئاغا و دەرەبەگایەتی، ئەوا جولەکەکان نەیان دەتوانی شۆڕشەکە بتەقێننەوە بەو شێوەیەی کە کردیان.

ئەو پارەو پولەی بۆ بەڕێوەبردنی شۆڕشی پیشەسازی ئەو کات پێویست بوو، لە ئەوروپا لەلای کەس نەبوو، تەنها دوو کۆمەڵ نەبێت، کۆمەڵی دەرەبەگەکان و کۆمەڵی جولەکە سو خۆرەکان.

دەرەبەگەکان بە هیچ شێوەیەك یارمەتی شۆڕشی پیشەسازیان نەدا! چونکە

ئەوان لە سەرەتا جوتیارن ( ئەگەر چی بەناو ئاغـە بـون ) جوتیـار خـۆی ناخاتـە مەترسیەوە و پارەکەی ناخاتە گەڕ، جگە لەو پارچە زەوییەی، کـە بـۆ کـشتوکاڵ دایدە چێنێ. ئەوەش کە لە باو باپیرانی بۆی مایتەوە و لە ئەزبەر(حفظ)ی کردوە، ئەگەر گۆڕانکاریەکانیشی ئەزبەر کردووە، ئەنجا ئەو تۆو بـەزەوی وەردەکـا، ئـەنجا کاتێك دێتە بەرهەم هەندێکی بۆخۆی دەخواو هەندێکیش دادەنێ بۆ داچاندنی بـۆ ساڵی داهاتوو، ئەوەی دەشمێنێتەوە لە بازار دەیفرۆشێ..

پاشان لەسەرەتایەوە شۆڕشی پیشەسازی وەنـەبێ لـە هـەموو بوارەکـان هـەر قازانجی کردبێ، چونکە ئەو کات چرِی دانیشتوان ئەوەندە زۆر نەبوو لە وڵاتـەکان، هەروەها ڕێگا و بانی خۆشکراویش نەبوو بۆ ئـەوەی بەروبومەکـەی بەڕوبـەرێکی بەرفراوان ساغ بکرێتەوە، پاشان دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش نـەبوو.. ئـەم شـتانەش هەموو لە پێویستیەکانی پیشەسازی بەرهەم هێنە، کە ناتوانێ دەستبەرداری بێ، بێجگە لەمەش چەند کۆسپ و تەگەرەیەکی دەرونی لە ڕووی شۆڕشی پیـشەسازی وەستا، چونکە خەڵکی لە -سادەو ساکاری خۆیان- زۆر کەیف خـۆش نـەبوون بـە بەرهـەمی ئـامێر، چـونکە هـەروەکو -بیروباوەڕیـان وابـوو- کـە ئـەو ئامێرانـە دەستێکی شەیتانیان لە ناوە و خێر و بەرەکەت لە ژیانیان نـاهێڵێ، بۆیـە ئـەوان بەرهەمی دەستی خۆیان پێ چاکتر بوو لە بەرهەمی ئامێر[1].

بـەڵام جولەکـە سـوخۆرەکان بـە بەشـدارییەکی زۆرەوە بـۆ یارمـەتی دان و دەوڵەمەند کردنی شۆڕشی پیشەسازی هاتنە پێشی، کە لە خۆشـیان لیکیان بە

---

1 / بەڕاستی گومانی خەڵکی لەم بارەیەوە راست دەرچـوو، چـونکە بەرەکـەت لـە ژیـانی خەڵکی بڕا، بەڵام نەك بە هـۆی خـودی پیـشەسازیەکە هـەروەکو ئـەوان بەسـادەو سـاکاری گومانیان وابوو، بەڵکو بەڕێگای ئەو سوخۆریە بوو کە کارگەکانی پێ هەڵدەسورا هەروەك کە لەمەو دوا باسی لێوە دەکەین.

دەم دەهاتە خوارێ! چونکە ئەوان پارەی خۆیان راستەوخۆ ناخەنە کارەوە، توشی زەرەرو قازانجیش نایەن، بەڵکو پارەکە بەسو دەدەن بە قەرز، قەرزاریش بە گوێرەی بازاڕ قازانج یان زەرەر دەکا، بەڵام ئەوان پارەکەیان پێش قەرزدانی، دەستەبەر و مسۆگەر کردیە. هەروەها قازانجەکەشیان دەستەبەر کردیە کە لە ڕێگای سوو بە دەستیان دەکەوێ بەو مەرجانەی، کە لەسەر قەرزدانی پارەکە دایان دەنا!.

بەم جۆرە شۆڕشی پیشەسازی هەر لە سات وکاتی یەکەمی دا، کەوتە ژێر چەپۆکی ئەوانەوە، هەر ئەوان بوونە بەرێوەبەرو بازرگانی. لە ڕێگای ئەو دەستکەوت و قازانجەی، کە لە ڕێگای سووەوە بە دەستیان دەکەوت، توانیان زێڕ بکڕن و، هەموو دراوەکانی جیهانیش بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیان بەهۆی کڕینی ئەو هەموو زێڕە، پاشان توانیان دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش بکڕن، پاشان سیاسەتمەدار و ویژدانەکانیشیان کڕی.. بەم جۆرە بەسەر هەموو زەوی زاڵ بوون! ئەنجا کاتێك زاڵ بون، جەنگیان لە نێوان وڵاتەکان وروژاند بۆ ئەوەی بڕەو بە دروست کردنی چەك بدەن -کە ئەوان هەر لە کۆنەوە بازرگانی بوونە- جا بە دروست کردنی چەك سامانەکەیان زیادی کرد و، توانیان زیاتر حوکم بەسەر چارەنوسی مرۆڤایەتی بکەن!

ئەمە بوو چیرۆکی زاڵ بوونی جولەکەکان-زۆر بەکورتی- کە ئێستا باڵی کێشاوە بەسەر هەموو جیهاندا. کە لە ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکەدا هێشتا زۆرشت ماوە درێژەی پێبدەین، بەڵام لێرەدا جێگای باس کردنی نیە، بەڵکو تەنها باسی ئەمانە دەکەین: بڵاوکردنەوەی بەد ڕەوشتی و ئاژاوەی جنسی و بێباوەڕی و سەرخۆشکەرەکان و جۆرەها شێتی جیاواز: شێتی تۆپی پێ.. شێتی خێرایی و

پەلەکردن..، شێتی سەماکردن.. شێتی جل و بەرگ (مودة) .. بگرە لە تەنیشت ئەوەش ئەو بەربەرەکانێیە بەردەوامەی، کە لە نێوان ولاتەکان دا هەیە، کە دەبێتە هۆی شێتی خۆ پر چەك کردن ئێستا پرسیارەکە دێتە پێش: ڕۆڵی ئوممەتی ئیسلامی لەو هەموو شتانەدا چی یە؟ یان باشتر بلێین بەر پرسیاریەتی لەم هەموو شتانەدا چیيە؟

بەڕاستی بەرپرسیاریەتی ئەم ئوممەتە زۆر لەوە گەورەترە و زۆر لەوە ترسناکترە لەوەی، کە بەبیری دا دێت لە بارودۆخی ئێستادا، چونکە ئێستا شکاوەو سست و بێدەسەلات بووە، لە هەموو لایەك لێدان و هێرشی دەکرێتە سەر.

ئەگەر بهاتایە ئەم ئوممەتە بەجێ بەجێ کردنی پەیامەکەی هەلسابا بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و، کردەوەی بە پێویستیەکانی بکردبا لە جیهانی واقیعدا، ئەوا لە کوێ پێش بینی دەکرا شۆڕشی پیشەسازی بەرپا ببێ؟.

بێگومان لەو ولاتانە هەلدەگیرسا، کە لە لایەنی زانستی و کردارییەوە زۆر پێش کەوتبوو، ئەمە لە کوێ دەبوو کاتێك ئەو ئوممەتە هەلسابا بەجێبەجێ کردنی پەیامەکەی؟

ئایا لە ولاتانی موسولمانان نەدەبوو؟ لە ئەندەلوس و ( صقلية ) ی ئیسلامی، یان لە ولاتەکانی تری ڕۆژهەلات؟

ئەگەر بهاتایە شۆڕشی پیشەسازی –کە لە داهێنانی ئامێر هەلقولاو بوو- لە ناو جیهانی ئیسلامی هەلگیرسابا، ئایا بەسو(ربا) بەڕێوە دەچوو، کە لە شەرعی خوا حەرام کراوە؟

بەلام کاتێك ئەم دەرگایە دادەخرێت –کە جوولەکەکان زۆر بە توندی چوونە

ژوورەوە لێی- ئایا ئەو هەلەیان بۆ دەرەخسا هەروەکو، کە بۆیان ڕەخساوە لە کۆنترۆڵ کردن و زاڵ بوون بەرێگای سو(ربا) و کۆکردنەوەی زێڕ و کڕینی ویژدانی سیاسەتمەدارەکان و تێکدانی ڕەوشت؟!

وەڵامەکە ئاشکرایە ... یان ڕەنگە ئێستا ئاشکرا بێت..

* * *

لە ڕاستیدا بەرزبونەوەو زاڵ بونی جولەکەکان و نانەوەی خراپەو خراپەکاری و تێکدانیان لە زەوی قەدەرێکی خوایە و نوسراوە لە کیتابی خوادا: ﴿ وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا: ئیسرائیلیەکانمان ئاگادارکرد و لە نامەکەیاندا هەواڵمان پێدان، سوێند بەخوا ئێوە تێکدان و خراپەکاری ئەکەن لە خاك و وڵاتی شام و قودس دا بە گوناهو تاوان، دو جار بەرز ئەبنەوەو زاڵ ئەبن بەسەر خەڵکیدا، بەرزبونەوەیەکی زۆر گەورەو زیاد لە سنور. ﴾ اسراء: ٤. ئەنجا یەکسانە ئەگەر بێتو ئەو دووجارەی باس کراوە لە مێژوو ڕووی دابێ، یان یەکێکیان ڕووی دابێ و ئەوی تریان واقیعی ئەمڕۆ بێت، هەروەکو، کە هەندێك کەس لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا وای بۆ دەچن، ئەوا لە کیتابی خوا ئاماژە هەیە بۆ گەڕانەوەیان بۆ تێك دان و نانەوەی خراپەو بەدفەڕی، هەروەکو، خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿...وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا...: ئەگەر بگەڕێنەوە سەر تاوان و گوناهان، ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ تۆڵەسەندن و ئازاردانتان. ﴾ اسراء:٨.

بەڵام کیتابی خوا فێری کردوینە ئەگەر شتێك قەدەری خوا بێت، مانای ئەوە ناگەیەنێ بەرپرسیاریەت لەسەر مرۆڤ هەڵبگرێ کاتێك هەڵس و کەوتێکی هەڵە

دەکەن و پەیوەندی بە قەدەرەکەی خواوە هەیە. لە بەسەرهاتی ئوحد دا، کە تیایدا موسوڵمانان سەرپێچی ڕێنماییەکانی پێغەمبەریان کرد ﷺ ، خوای گەورە لەو بارەیەوە فەرمودەی خۆی نارده خوارێ، کە دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُم مِّثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِندِ أَنْفُسِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، وَمَا أَصَابَكُمْ يَوْمَ الْتَقَى الْجَمْعَانِ فَبِإِذْنِ اللَّهِ وَلِيَعْلَمَ الْمُؤْمِنِينَ، وَلِيَعْلَمَ الذين نافقوا ....: ئاخۆ کاتێ زیانوو لە دوژمنەوە پێگەیشت -کە جارێکیش دوو ئەوەندەتان زیان لێدان- هیچ پرسیتان: زیانەکەمان لە چی بوو؟ بڵێ: لە خۆتانەوە بو، خوا بۆ هەموو شت توانایە. هەرچی ئەو ڕۆژە توشو هات -وا دوو کۆمەڵ بەیەك گەیین-{ گشتی} بە ئیزنی خودا بوو، هەتا خاوەن باوەڕەکان نیشان بدا، تا دوڕو گەلیش بناسێ﴾ ال عمران: ١٦٥، ١٦٦.

ئەم بەسەرهاتە قەدەری خوایەو حیکمەت و داناییەکەی هەر ئەو دەزانێ. بەڵام تێیدا بەرپرسیارن. چونکە سەرپێچی فەرمانی سەرکردەی خۆتان کرد ﷺ.

زاڵ بونی ئێستای جولەکەکان قەدەری خوایە، و حیکمەتەکەش هەر لە لای ئەوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بەرپرسیاریەت لەسەر ئەم ئوممەتە ئیسلامیە لابدات، کە خوای گەورە بەرپای کردوە بۆ ئەوەی ببێتە شاهێدو رابەر بۆ هەموو مرۆڤایەتی.

بەڕاستی ئەم ئوممەتە بەرامبەر گەیاندن و بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی بەڕونی کەمتەرخەم بوود، ئەنجا چ بەو دووبەرەکیەو جیاوازیانە بێت، کە دەوڵەتی موسوڵماناتی لە ئەندەلوس لە ناو برد ( ئەندەلوس لەو کاتەدا سەرچاوەی زانست و شارستانیەت و پێشکەوتن بوو لە ئەوروپا) کە ئەمیرەکان هەندێکیان دژی

هەندێك پشتیان بە خاچ پەرستەكان بەست(!) یان بەو بەستنە فیكری و گیانی و زانستی یە بوو لە ڕۆژهەڵات، یان بەو بیدعەو تاوان و لادانە بوو لە عەقیدە، یان بەو كەم تەرخەمیە بوو لە ئامادەكردنی كەرستەو كەل و پەلی جەنگ، یان بەو دەست لێ بەردانە بوو لە ئاوەدان كردنەوەو بنیات نانی زەوی، یان بەو بێدەنگی یە بوو لە ئاست سەركوتكردنی سیاسی، یان..... یان... .

پاشان ئەنجامەكەی بە گوێرەی سوننەتی خوا وای لێ هات ، كە بوون و قەوارەی ئیسلامی بەرەو كزی بچێت لە گۆرەپانەكە، بەهۆی ئەو گۆڕانكاریەی ڕویدا دا لە ڕاست و دروستی ئیسلام لە دەرونەكان: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمْ...: چونكە خودا دەروی چاكەی لەهەر گەلێ وە كردبێ، هەتا ئەوان بیری خۆیان نەگۆریبێ، قەت خودا لێی نەگۆریوون﴾ انفال: ٥٣ .

لە ئەنجامی كز بونی ئیسلام، هێزی جاهیلی لێ كەوتەوە، كە ئەمڕۆ فەرمانڕەوایی دەكات، جا مەبەستمان پێی ڕۆژ ئاوابێ، یان ئەمریكا بێت، یان ئەو جولەكانە بێت كە لێرەو لەوێ زاڵ بوون.

ئەم ئوممەتە ئیسلامیەش لەم بارەوە لەبەردەم خوا بەرپرسیارە... بەرامبەر بە مێژووش بەر پرسیارە.

لە كۆتایی باسەكەدا دێینە سەر خاڵێكی گرنگ، كە پێویستە ئامـاژەی بۆ بكەین. بەڕاستی ئەمڕۆ زۆربەی ئەو كەسانەی وت و وێژ لە بارودۆخی ئەمڕۆدا دەكەن دەبنە دوو گروپ، گروپی یەكەم خەتاو گلەیی دەخاتە ئەستۆی ئەم ئوممەتە ئیسلامیە، گروپی دووەم خەتاو گلەیی دەخاتە ئەستۆی ڕۆژئاواو پیلانەكانی دژی

ئیسلام، هەر گروپێکیش لەم دوو گروپە زۆر _ بەگەرمی _ بەرگری لە بۆچونەکەی خۆی دەکات و گلەی _ یان جار جار _ نەفرەتیش لە گروپەکەی تر دەکات.

بیرکردنەوە بەم جۆرە شێوەیە چەند ئەنجامێکی هەڵەی لێ دەکەوێتەوە ئەنجا چ ئەو کەسانە عەلمانی بن، ئەوانەی گاڵتە بە بیرۆکەی پیلان گێران دەکەن و گەمە بە خاوەنەکەی دەکەن، یان لەو ئیسلامیانەی، کە ڕاڤەی مەسەلەکە هەموو بە پیلان گێران دژی ئیسلام لێك دەدەنەوە.

ئەمڕۆ لە گۆڕەپاندا هەردوکیان هەن! سەلماندن و هەبوونی یەکێکیان، مانای رەت کردنەوەی ئەوی تریان نیە! چونکە دژ یەك نینە، کەمتەرخەمی ئومەتی ئیسلامی، ڕاستیەکی واقیعە. هەروا پیلان گێڕانی ڕۆژئاوا دژی ئیسلام، دیسان ڕاستیەکی واقیعەو کەسیش ناتوانێ نکوڵی بکات، مەگەر ئەو کەسەی خۆی باوێتە ناو هەڵەوە. ئەم دوانە هەر دووکیان کار لەیەکتری دەکەن، چونکە ئەگەر ئومەتی ئیسلامی کەمتەرخەمی نەکردبا بەرامبەر بە گەیاندن و ئەنجامدانی پەیامەکەی، ئەوا ڕۆژئاوای خاچ پەرست نەیدەتوانی پیلانەکانی جێ دژی ئیسلام بە جێ بکات، ئەگەر پیلان گێڕانیش نەبوایە، ئەو ئومەتە هەوڵ دان و ماندوبونەکەی بەفیرۆ نەدەڕۆی بۆ دوبارە هەستانەوە لە خلیسکانەکەی.

ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ، کە لەسەرەتای باسەکەماندا هێناومانەوە، ئاماژە بۆ هەردوو مەسەلەکە دەکات، کە پێکەوە هەن و ڕاستن: کۆبونەوەی نەتەوەکان لەسەر ئەم ئومەتە هەروەکو خۆرە چۆن دەم ئەژەنێتە خواردنەکەی ( ئەوە پیلانەکەیە )، هەروەها ئەو ئومەتە لە باری ئێستای وای لێ

هاتوە، کە وەکو کەفی لافاو بێ، بەو وەهنەی کە توشی هاتوە، وەهنەکەش بریتیە لە خۆشویستنی دونیاو ڕق بوونە لە مردن.

بەڕاستی ئەم فەرمودەیە، کە ئەمڕۆ ئەوها بە وردی باس لە حاڵ و گوزەرانمان دەکات لە سروش (وحي)یەوەیە... بەڕاستی لە ئیعجازەوەیە لە ئیعجازەوەیە.

## موسوڵمانان چیان هەیە؟

موسوڵمانان بەسەر سامیەوە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوییەوە لە دەستی خۆیان دەدەن و دەڵێن: بەرامبەر جیهانگەری ( عولمة ) چی بکەین ؟ ئایا لە ئێستاو ئاییندەدا خاوەن شتێك دەبین؟

دەربارەی ئێستا ڕەنگە وەڵامەکە قورس بێت.. بەڵام نا، چونکە جیهانگەری ( عولمة ) ئەو دێوەیە کە نابەزێ، خەڵکی لە بەرامبەری دا هیچیان پێ ناکرێ، تەنها گوێڕایەڵی و خۆبەدەستەوەدان نەبێت.. بەڕاستی ڕووبەڕوو بوونەوەیەك دژی جیهانگەری ( عولمة ) دەستی پێکرد لەو کۆنگرەی، کە لە شاری ( سیاتل ) بەسترا بەڵام _ بەداخەوە _ لە غەیری موسوڵمانان بوو!

بەڕاستی زەحمەتی وەڵامەکە لەو بار(حال)ە خراپەیە دێت، کە ئوممەتی ئیسلامی گەیشتۆتێ...

ئەو ئوممەتە لە هەموو مێژووی خۆیدا هەتا ئێستا نەگەیشتۆتە ئەو پلەیە لە سوکی و نزمی لەسەر خۆی و لەسەر خەڵکیش، کە ڕاودەنرێ دەردەکرێ بە دەیان هەزارو سەدان هەزار ڕۆڵکانی سەر دەبڕدرێ لە ئەوروپا و لە ئاسیا و لە ئەفریقیا، کەچی جوڵەش ناکات، بەڵکو هەڵوێستێکیش بۆ ڕاگرتنی ئەو قەیابخانە وەحشیگەریە نانوێنێ، یان بەربەرچی داتەوە، فەڵەستینی لێ زەوت دەکرێ، قودسی لێ زەوت دەکرێ، کە چی ئەو ڕاوەستاوەو وەك دیل تەماشا دەکا..

لەلایەکی تریش هیچ کات جیهان ئەوها بە تێکڕایی لەسەر ئەم ئوممەتە ئیسلامیە کۆ نەبویتەوە هەروەکو ئێستا کۆ بویتەوە، کە مافەکانی بە ئاشکرا دەخورێ، زادو زەخیرەی بەتاڵان دەبردرێ، دژایەتی ئایینی و بیروباوەڕەکەی و

بنەمای بوونی هزری و ڕۆحی و ماددی دەکرێت..کەچی دەستە وەستانەو لە ویست و ئیرادەی زەوت کراوە.. ئەگەر بیەوێ جوڵەیەکیش بکات یان خۆی بدوێنێ، ئەوا پەنجەی چەتە(عصابة)ی هەموو وڵاتەکانی دەگاتێ و هەموویان هاوار دەکەن: ئوسولێنە! تۆقێنەر(إرهابي)ن! بیان کوژن! یان بیان کەنە نێو بەندیخانەوە!

لە هەمان کاتیشدا کەم و کوریەکی زۆر لە ئامرازەکانی ڕوبەڕو بوونەوە هەیە..

لە ئامرازەکانی ڕوبەڕو بوونەوە شارەزایی تەکنەلۆژی و دروست کردن (تصنیع)ە، کە ئەم ئومەتە لە هەردوولایەن دا هەژارە بە جۆرێك دەگاتە نزیکەی سنوری مایە پوچی(مفلس)، لە لایەکی تریش چەند دڕندەیەکی زیانبەخش کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی تەڕو وشك پێکەوە بخۆن، بۆ ئەوەی هەموو جوڵەیەك لە کاربخەن، کە بیەوێ شارەزایی و فراژ بونی بەرهەم هێنان (نتیجة الانتاج) بە دەست بێنێ.

بەڵێ! بەڵام..!

لە کۆنەوە کە هێشتا نەوجەوان بووم فەرمودەیەکی پێغەمبەرﷺ هەڵوەستەی پێدەکردم، کە دەفەرموێ: (( من رأى منكم منكرا فليغيره بيده، فمن لم يستطع فبلسانه، فمن لم يستطع فبقلبه، وهو أضعف الايمان[١]: کێ لە ئێوە کردەوەیەکی خراپی دی، بابەدەستی خۆی بیگۆڕێ، ئەگەر پێی نەکرا، با بەزمان بیگۆڕێ، ئەگەر پێی نەکرا با بەدڵ بیگۆڕێ، ئەمەشیان کزترین باوەڕە)).

---

٨ / متفق علیه.

فەرمودەیەکی دیش هەر لەو بارەیەوە دەفەرموێ: (( فمن جاهدهم بیده فهو مؤمن، ومن جاهدهم بلسانه فهو مؤمن، ومن جاهدهم بقلبه فهو مؤمن. ولیس وراء ذلك من الایمان حبة خردل[١]: ئەوەی بە دەست جیهادیان لە گەڵ بکا ئەوە بڕواداره، ئەوەی بە زبان جیهادیان لە گەڵ بکا ئەود بڕواداره، ئەوەی بە دڵیش جیهادیان لە گەڵ بکات ئەوا بڕواداره، لە پاش ئەمە تۆزقاڵێك باوەڕی نامێنێ)).

ئەم فەرمودەیە هەڵوەستەی پێدەکردم، چونکە پێغەمبەرﷺ ناوی ناوە جیهاد و ناوی ناوە گۆڕین لە گەڵ ئەوەی، کە هەر لە ناو دڵە، هیچ شتێك ناگۆڕێ لەو واقیعەی، کە مەبەستە بگۆڕدرێ!

بەڵام کاتێ وشیاریم گەورە بوو، ئەومونم زیادی کرد، چەند شتێك لەمانای فەرمودەکە تێگەیشتم، کە پێشتر لێم شاراوە بوو.

بەڕاستی سوپا لە جەنگ دا توشی دۆران دێت، پاشە کشە دەکات، دوژمن ناچاری دەکات، بیباتە دەرەوەی گۆرەپانی جەنگ.. بەڵێ! بەڵام! لێرەدا قەڵاتێکی کۆتایی ماوە خۆی لەناو حەشار بدا هەتا هەلێکی دی بۆ دەرەخسێ بۆ هاتنەوە ناو گۆڕەپانی جەنگ. بەردەوام ئەگەر بێتو خۆی لەناو لەم قەڵاتە بپارێزێ و خۆی حەشاربداو نەیداتە دەست دوژمن، ئەوا لە حاڵەتی جیهادکردن دایە، چونکە ئەو هێشتا سەربازییەتی و ئامادەکاری خۆی پاراستوە. بەڵام ئەگەر قەڵایەکەی دا بەدەستەوە ئەوا شتەکە کۆتایی پێ هات، دۆڕان توشی دەبێت، کە ناتوانێ لێ ی قوتاربێ!

ئەم قەڵایە سەبارەت ئیشە خراپ ( منکر )ەکە دڵە..

---

[١] / أخرجه مسلم.

پاشان پێغەمبەرﷺ ناو لە نارەزایی و نکۆڵی بە دڵ دەنێ جیهاد، ناوی دەنێ گۆڕین، لەگەڵ ئەوەی هیچ شتێك لە واقیعی ئێستادا ناگۆڕێ.

بەڕاستی ئەوەی بە دڵ ئیشی خراپ دەبوغزێنێ، خۆی نەدایتە دەست ئەمرێ واقیع، شەرعیەتی بونیشی نە دایتێ. ئەو واقیعەشی بە ڕاست دانەناوە، یان شتێکە پێمان نوساوە قوتاربونمان لێ ی نیە، بەلکو ئێستا ئەو تەنها وای داناوە، کە لەو سات و کاتە بەهۆی بێ هێزی بەرامبەر زیانی ئیشە خراپەکە و پەك کەوتوە لە گۆڕینی دەستەوسانە. بەلام باوەڕی وایە _ کە هەر ئەو هەلوێستەی ئەو ڕاستە، هەر ئەوەش شەرعیەتی هەبونی هەیە، بەلام ئیشە خراپەکە هیچ شەرعیەتی نیەو، لەسەر ڕاستیش نیە، با ئێستاش لەم سات و کاتەدا زاڵ بوونی هەبێت.

جا ئەو کەسەی قەلای بەدەستەوە داوەو لە جەنگەکە لەگەڵ ئەو کەسەی دەستی شوشتوە، وەك یەکن؟

بێگومان نەخێر! هیچ وەکو یەك نین!

کەسی یەکەم حالی حازر دەستەوەستانە. بەلێ، هیچی بۆ خۆی پێ ناکرێ چونکە چوار دەورە دراو و گەمارۆ دراوە و بێ هێزە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەر باوەڕی بە کێشەکەی خۆی ماوە. بەردەوام چاودێری ڕووداوەکان دەکات، لە هەلێك دەگەڕێ کە بۆی برەخسێ جا لەهەر ساتێکدابێ، بۆ ئەوەی لە قەلایەکەی بێتە دەرو، بگەڕێتەوە ناو گۆڕەپان.

بەلام ئەوی تر، کە قەلایەکەی داوەتە دەست دوژمن، کێشەکەی لە هەستیا کۆتایی پێ هاتووە، خۆی داوەتە دەست ئەمری واقیع، بیرلە گۆڕینی

ناکاتەوە. بەڵکو خۆی بەهەڵە زانیوە لەو هەڵوێستانەی، کە پێشتر هەیبووەو عەزمیشی جەزم کردوە، کە نەگەڕێتەوە سەری!

لە ڕاستیدا جیاوازیەکی زۆر هەیە. پێغەمبەرﷺ بەوەی خوا سروشی بۆ کردووە، _ بەوەی خوا فێری کردوە _ ڕاستی جیاوازی نێوان ئەم دوو شتە دەزانێ. بەڵام لە هەمان کاتیشدا ئاگاداری مەیلدان بەلای ڕەوشی سرەوتن و جێگیری دەدات! پێغەمبەر _ دەزانێ بەوەی خوا فێری کردوە _ کە دەرونەکان توشی سستی و خاوبونەوەو دانیشتن دێن! بۆیە ئاگاداری دەدات و دەفەرموێ: (( وذلك اضعف الايمان: ئەمە کەمترین باوەڕە)). ((وليس وراء ذلك من الايمان حبة خردل: لە پاش ئەمە تۆزقاڵێك بڕوا نامێنێ)). ئەنجا بۆ ئەوەی بڕوادار موکڕ بێت لەسەر هەڵوێستی دواِینی با بارودۆخەکە هەر چۆنێك بێت، لانەدات.

ئەوەی کاری خراپ ( منكر ) بە دڵ دەبوغزێنێ نابێ بەشداری لەو کارە خراپە بکات، کە ناتوانێ بیگۆڕێ، بەشداری تێدا ناکات، مەگەر زۆری لێ بکرێ، چونکە ئەگەر بەشداری کرد بە ڕەزامەندی خۆی و قەناعەتیشی وابوو، ئەوا قەڵایەکەی داوەتە دەست و جەنگەکەی بەجێ هێشتووە، بێ ئەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوە !

بەڕاستی ئەمە ئەو (جیهاد)ەیە، کە پێغەمبەرﷺ ئاماژەی پێکردووە.. ئەو کەسە جیهاد دەکات بۆ ئەوەی لە ڕێگا نەگلێ[1].. جیهاد دەگەڵ ئەو دۆڕانە ناوەکیە دەکات، کە هیچ قوتاربونی نیە، چونکە لە نەخۆشیەکانی دڵە. (( ألا وان فی الجسد مضغة اذا صلحت صلح الجسد کله، واذا فسدت فسد الجسد کله. الا

وهى القلب[1]: پارچە گۆشتێك لەناو جەستەدا هەیە، ئەگەر چاك بێ هەموو لەش لەگەڵی چاك دەبێ، ئەگەر خراپیش بێ هەموو جەستە دەگەڵی خراپ دەبێ، ئەوەش دڵە)).

- ئوممەتی ئیسلامی لەم سات و کاتەدا لە مەیدانی ئابوری و پیشەسازی خاوەنی هیچ شتێك نیە بۆ ئەوەی بەرامبەر ئەو گەردەلولە ڕاماڵە بوەستێت ، کە جیهانگەری ( عولمة ) دەری دەکا، بۆ ئەوەی هەموو زەوی کۆنترۆڵ بکاو بیخاتە ژێر چەپۆکی خۆی..

دەڵێم ڕەنگە، ناشلێم شتەکی جەخت کراویشە، ئەویش تەنها ڕۆیشتن لەگەڵ ئەو شیمانە[2] خراپەی، کە بانگخوازی جیهانگەری ( عولمة ) وێنەی دەکێشن، کە دەڵێن: جیهانگەری ( عولمة ) بلیمەتی بلیمەتانەیە، کە کەس ناتوانێ لە ڕوی دا بوەستێ..

بەڵام ئەو ئوممەتە لە گەڵ ئەوەشدا _ هەتا لەو کات و ساتەش دا _ خاوەنی شتی زۆر زۆر دەبێ، ئەگەر پەنا بداتە قەڵایەکەی و خۆی بپارێزێ لەو بەزینە ناوەکیەی، کە دڵی بەزیوەکان ڕیشەکێش دەکات.

بەڵام لێرەدا کێشە ئابوریەکان باس ناکەین، بەڵکو بۆ پسپۆرانی بەجێدێڵین بۆ ئەوەی لە مەسەلەکانی بکۆڵنەوە، بەڵکو تەنها ئاماژەیەك دەکەین، کە ئەو ناوچەیەی ئیسلامی تێدا درێژ بویتەوە، لە دەوڵەمەندترین ناوچە و پارچەکانی

---

1 نەگلێ : نەکەوێ.

1 / رواه الشيخان.

2 شیمانە : إحتمال.

زەوی یە، بگرە بەسەرچاوە سروشتیەکانیەوە لە ئاو و ڕووەك و کەرستەی خاو، بێجگە لەوەی کە ئەمڕۆ ژمارەی دانیشتوانی دەگاتە زیاتر لە ملیارێك. کە دەتوانی _ لەسەر ئەو هەموو بێ هێزیەی، کە سکاڵای بەرامبەر دەکا _ چەند یەکە _ یان چەند یەکەیەکی _ ئابورێ پێك بێنێت بۆ بەهرە لێ وەرگرتن لە سەرچاوەو وزەکانی بە شێوەیەکی باشتر، بۆ ئەوەی خۆی بەرامبەر فشارەکان ( الضغوط ) ڕابگرێ، هەروەکو ئێستا مالیزیا وا دەکات، لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپ و لەمپەرانەی، کە بەئەنقەست لە ڕێگایدا دادەنێن بۆ ئەوەی نەتوانێ لە گەمارۆ و ئابلۆقە ڕزگاری ببێ!

لەگەڵ ئەو هەموو کۆسپ و لەمپەرانە، دەتوانرێ شارەزایش بە دەست بهێنرێ.. ئەو بیروهۆشە ئیسلامیە کۆچ کردوەی _ کە بارودۆخی تایبەت، یان گشتی ناچاری کردونە کۆچ بکەن بۆ ڕۆژئاوا _ ئەوا خاوەنی خیبرەو شارەزاییان هەتا لە وردترین کاروبار... کاروباری وزەی ناوکی و چوونە ناو بۆشایی ئاسمان!

لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە کاروباری ئابوری بۆ پسپۆران و شارەزایان بەجێدەهێلین..

بەڵام ئەم ئومەتە لە کاروباری تردا، بەهەر تاکێك کە تیایدایە ئەوە لایەنی پسپۆڕیە کەلەم کاروبارەوە خاوەنی شتی زۆر زۆرە! کاروباری عەقیدەو بیروباوەڕ.. کاروباری ڕەوشت... کاروباری ڕێبیر(مبادیء).. کاروباری مرۆڤ و، مەبەست لە بونیداو، پێوانەی ئەو شتانەی بەجێی هێناوە.

ئەم کاروبارانە هەموو تاکێك خاوەنیەتی بە خاوەنداریەکی تایبەت، بەمانای ئەوەی، کە بەشێکە لە قەوارەی خۆی و دانابڕێ لە کەسایەتی خۆی، دەتوانێ

لەناو دڵی پارێزگاریان لێ بکات _ لەناو قەڵایەکەی _ سەرەڕای هەر فیتنەو ئاشوبێك، کە لە چواردەوریدا بن.

موسوڵمان لەو کاروبارانە خاوەنی زاد و توێشویەکی خوایی ڕەسەنە، کە پڕوپوچ لە ڕوی ناوەستێ چ ڕوبەڕو، چ پاشملە، بەڵام ڕۆژئاوا خاوەنی کاڵاو شتومەکی ساختەیە، ئەگەرچی زۆر بریقە داریشی بکا؛ چونکە کاڵایەکە مرۆڤ لەوکاتەی کە لە توندترین حالەتی داڕوخانی ڕۆحی گیانی و ڕەوشتی دا بوون، دروستیان کردوە، ئەویش بە هۆی باروودۆخێکی ناوچەیی تەواو لەلای خۆیان، ئەگەر چی پێیان وابێ کە خاوەنی خەسڵەتێکی ئادەمیزادی گشت گیرد، کە پێویستە سەرانسەری دونیا بگرێتەوە!

## مرۆڤ لە ڕوانگەی ڕۆژئاوادا چی یە؟!

مرۆڤ ئەو ئاژەڵە پێش کەوتوە داروینیەیە، کە هۆش و پەنجە و کەلەی(!) پێش کەوتووە، کە توانی قسە بکات و بیربکاتەوەو کەل و پەلەکان بەکاربێنێ، بەم جۆرە شارستانیەتی ماددی دروست کرد..

ئامانجیش لە ژیاندا لەلایەك چێژ وەرگرتنە بە هەستەکانی، لەلایەکی تریش سەرکەوتنە لە ململانێ _ ململانێی مانەوە _ ئامڕازەکانی لە ململانێ دا زانست و جەنگ و سیاسەتە.

پاشان ئەو مرۆڤە هەر خۆی سەرچاوەی خۆیەتی، هیچ سەرچاوەکیش لە سەروی ئەو نیە، هەرکاتێکیش ئەنجامی دەدات. تاکە پاساوی ئەوەیە، کە لەوەوە دەرچووە.. واتە ئەو خوایە..

ئەم ئاژەڵە خۆ بە خوا زانە دەیەوێت (( شارستانیەتەکەی )) لەسەر هەموو زەوی بسەپێنێ!!

نەخێر بەخوا! بەئیزنی خوا بەهیچ شێوەیەکیش ڕونادات..

ئەو مرۆڤەی، کە خوای گەورە دروستی کردوە، زۆر لەوە گەورەترە، زۆر لەوە بەرێزترە لەوەی، کە ئەو شارستانیەتە ساختەیە دەیەوێت لە چەند شتێك دا گەمارۆو گۆشەگیری بکات:

﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً: ئێمە ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت و لە وشکانی و لە زەریادا هەڵمان گرتن، ڕۆزی پاکژمان پێدان، لە چاو زۆر لە کردەی خۆمان زۆر پتر قەدرمان گرتوون ﴾ اسراء: ٧٠.

ئەو مرۆڤە لە چنگێك قوڕی زەوی و فوکردنێـك لـە گیـانی خـوا دروسـت کراوە..

﴿ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِن طِينٍ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيـهِ مِـن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ: کاتێك خوای تۆ بە فریـشتەکانی ڕاگەیانـد: وا خـەریکم مرۆڤێك لەقوڕ دروست بکەم؛ هەر کا لەشیم تەواو کردو لە گیانی خۆم فووم پێـدا کرد، هەمووتان سوژدەی بۆ بەرن﴾ ص: ٧١، ٧٢.

ئەوانەی هەڵسوکەوت دەگـەڵ چـنگە قوڕەکـەدا دەکـەن و فەرامۆشـی فـووە گیانیەکەی دەکەن، ئەوە لە ڕاستیدا هەلس و کەوت دەگـەڵ (( مـرۆڤ )) ناکـەن، بەڵکو هەڵس و کەوت دەگەڵ شێوەیەکی گـۆڕاوو تێـك چـوودا دەکـەن، کـە خـوا دەربارەیەوە دەفەرموێت لە ئاژەڵ گومڕاترە: ﴿...لَهُمْ قُلُوبٌ لاَّ يَفْقَهُـونَ بِهَـا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَّ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَّ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ: دڵیان هەیەو پێی تێ ناگەن؛ چاویان هەیـەو پـێی نـابینن، گوێیـان هەیەو پێی نابیسن، ئەوانە وەکو ئاژەڵن، بگرە لەوان گومڕاترن؛ ئاگایان لە هـیچ شت نیە﴾ اعراف: ١٧٩.

ڕۆژئاوا هەرچی هەیەتی لە پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆژی و ئـابوری و جەنگی و ڕامیاری، هیچ شەفاعەتیان بۆ ناکـات و هـیچ بـەرزیان ناکاتـەوە لـەو نزمیە کە تیایدان، هەتا نەگەڕێتەوە بۆ مرۆڤایەتیەکان هەروەکو خوا لـە چـنگێك قوڕو فوو تێکردنێکی گیان دروستی کردوە..

بەڵام بە خودا کردنی ئەم ئاژەڵە _ کە جیهانگەری ( عولمة ) بەشێکە لـەم بە خودا کردنە_ ئەوا لەلای خوا ناپەسەند و نەفرەت لێ کراوە، لە زەویـش دا بـە

گـوێرەی سـوننەتی خـوا بـەرەو نـەمان دەچـێت، جـا هـەر چـەندە خاوەنـەکانی ماوەیەکیش لە زەویدا خۆیان بەگەورە زان بزانن!

هەڵبەت شارستانیەتی ڕۆژئاوا خاوەنی شتی زۆر زۆر چاکە، کە کەس نابێ نکۆڵی لێ بکات، کەگەر ئەو کەسەی خۆی بە هەڵە دا ببـات، هـەروەها خـاوەنی شتی زۆر زۆر خراپیشە، کە کەس نابێ نکۆڵی لێ بکـات، مەگـەر ئـەو کەسـەی خۆی بە هەڵە دابیات.

پێشکەوتنی زانستی و تەکنـەلۆژی و بلیمـەتی لـە ڕێکخـستن و جـۆش و خرۆشی لە وەرگرتنی شتەکان و کۆڵ نەدان و پشو درێژی.. ئەمانە هەمووی شـتی چاکن. بە گوێرەی سوننەتی خواش، هەر ئەو شـتانەنە پـشتی ئـەم شارسـتانیەتە دەگرێ و تەمەنی لە زەوی دا درێژ دەکات: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ: هەرکێ ژینی ئەم دنیایـەو زەرق و بەرقی ئەوی دەوێ، ئێمە پاداشتی کردەوەیان _ بە تـەواوی _ هـەر لـەم دنیایـە دەدەینێ و چیشیان لێ کەمەوە ناکرێ﴾ هود: ١٥

گەندەڵی شتی ڕۆحی و بێ سەروبەری جنسی و بەرەڵایی لـە سـنور تێپـەڕیوو ڕیزپەڕیی(شذوذ) و ئارەق و تریاك و تاوان، هەروەها لە سـنور لادان لەسـەر زەوی بەبێ حەق و سوك و نزم کردنی خەڵك و تورە کردنیـان، ئەمانـە هـەمووی شـتی خراپن، بە گوێرەی سوننەتی خـوا _ چارەنووسـی وای لێـدێت ئـەو شارسـتانیەتە لەناو ببات، هەر چەندە مانەوەشـی لەسـەر زەوی درێـژە بکێـشێ: ﴿...حَتَّى إِذَا فَرِحُواْ بِمَا أُوتُواْ أَخَذْنَاهُم بَغْتَةً فَإِذَا هُم مُّبْلِسُونَ: ئەوسا کاتێك کەوتنـە خۆشـی و شادی لە پڕو ناکاوێك بەو تورەیی خۆمان خستن و هـەموو نـا هومێنـد مانـەوە﴾

انعام: ٤٤.

﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانْظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ: بەر لە ئێوە زۆر ڕێگاو شوێن تێپەڕیون. جا ئێوە لەم سەر زەمینە گەشتێ بکەن و سەرنج بدەن کە ئاخری کاری حەق بەدرۆ زانان بەکوێ گەیشت؟﴾ ال عمران:١٣٧.

﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَمْلَيْتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٌ ثُمَّ أَخَذْتُهَا وَإِلَيَّ الْمَصِيرُ: بە زۆر شاران کە ناحەق بوون و مۆڵەتم داو لە پاشانا وەبەر تووڕەیی خۆم خستن چارەنوسیش هەر بۆلای منە﴾ حج: ٤٨.

شتێك هەیە دەبێ بزانرێ، کە ئەم شارستانیەتە خاوەنی شتێکە، بە جۆرێك حەق و ناحەقی تێکەڵ بووە ، کە لەلای زۆر کەس شاراوەیە ، زۆریش لە خەڵکی دەهاوێتە ناو فیتنەوە ئاشوبەوە، شێوە جوان و بریقەدارەکەی دەیان گرێت و سەرنجیان ڕا دەکێشێت، بۆیە چاویان لەمەڕ بینینی خراپەکانی دەکەوێ. ئەو شتەش (( دیموکراسیەت )) و (( مافی مرۆڤە )).

خەڵکی باوەڕ ناکەن کە ئەم شتە شانۆ گەریەکی جوانە، کە چەندی شتی پرو پوچی تێدایە بە ئەندازەی ئەوەش ڕاستی تێدایە!

بێگومان دیارترین ڕووی، ئازادی سیاسیە، یان ئەو مافە دەستەبەر کراوانەیە، کە (( گەلەکان )) وە دەستیان هێنا لە ڕوو بە ڕوو بوونەوەی ئەو زۆردارە دیکتاتۆرانەی، کە لەمەو پێش حوکمیان دەکردن، کە (( تاك )) بەرامبەر بە (( وڵات )) وەدەستی هێناوە.

بەڵام کێیە ئەو کەسە زاڵە ڕاستەقینەی لە پشت ئەم شانۆگەریە جوانەوە،

کە تاکی ئاسایی _ لە زۆر حاڵەتدا ناوی دەنێن (( پیاوی شەقام )) _ وەك بلێی هەر ئەوە حوکم دەکات، هەر ئەوەم بڕیار لەسەر چارەنووسی کاروبارەکان دەدا؟!

لە ڕاستیدا ئەوە سەرمایەیە! ئەدی کێ بەسەر سەرمایەکاندا زاڵە؟! ئەوانە _ ڕاستەوخۆ _ جوولەکەن!

ئا لێرەدا ڕوون دەبێتەوە، کە چۆن جولەکە لە ئەمریکا _ کە ژمارەیەکی کەمیشن _ هەر خۆیان دەست نیشانی سەرۆك کۆمارەکان دەکەن، هەر ئەوانیش ئەگەر بیانەوێ دەیانهێننە خوار، یان دەیان کوژن هەروەکو، کە ( کنیدی )یان کوشت لە ساڵی ١٩٦٣ ز کاتێك بە هەواو ئارەزوی ئەوانی نەکرد.

هاولاتی لەوێ خۆی نوێنەری خۆی هەڵدەبژێرێ، ئەوانەی دەچنە ناو پەرلەمان، هەر ئەوانیش لێپرسینەوە لە حکومەت دەکەن و بڕیاری سیاسەتەکەی بۆ دەدەن. هاولاتی نوێنەری خۆی هەڵدەبژێرێ بە ئازادیەکی تەواو، کەنە فشار(ضغط)ی تێدایە نە ساختە.

بەڵێ! بەلام!

کێ ئەو هاولاتیە ئاڕاستە دەکات بۆ هەڵبژاردنی فڵان یان فیسار؟

ئایا زیرەکی خۆی؟ یان بیرکردنەوەی خۆی؟ یان قوڵبونەوەی لە لێکۆڵینەوەی کارو بارەکان و هاوسەنگی لە نێوانیاندا؟

یان دەزگاکانی ڕاگەیاندنە، کە ئەفکاری خوازراو دەخاتە سەری و، پاشان ئاڕاستەی دەکات بە ئاڕاستەیەکی خوازراو؟

کێ خاوەنی دەزگاکانی ڕاگەیاندنە؟!

لە ڕاستی دا پێشبڕکێیەکی توند لە نێوان حیزبەکاندا هەیە بۆ بردنەوەی

ژمارەیەکی زۆر لە کورسی بۆ ئەوەی بتوانن دەست بەسەر حوکم دا بگرن، ئەم پێشبڕکێیەش _ بەسەر بەستیەکی تەواو دەکرێت _ دور لە هەموو دەست تێوەردانێکی حوکمەت کە دەیسەپێنێ.

بەڵام..لە کۆتاییدا جیاوازی چی یە لە نێوان ئەو حکومەتەو ئەوی تر لە کاروبارە سەرەکیەکە، ئەویش زاڵ بوونی سەرمایەیە، هەروا زاڵ بوونی ئەو کەسانەشە، کە زاڵن بەسەر سەرمایەدا ؟!

ئایا هیچ جیاوازیەکی ڕاستی هەیە ؟!

ئەنجا ئەوەی دەیەوێ با خەیاڵ بکا، کە ئەو کاروبارەکان هەڵدەسورێنێ! ئەوەی دەیەوێش با خەیاڵ بکا، کە (( گەل )) لە حەقیقەتدا حوکم دەکات، گرنگ نیە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئەم شتە زیان بە بەرژەوەندی سەرمایەداری نەگەیەنێ!

ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەو دروشمەی، کە جولەکەکان لە شۆڕشی پیشەسازی دا بەرزیان کردبۆوە _ کە دیموکراسیەت لەو شۆڕشە هاتە بوون _ ئەوا چەند شتێکی زۆر گرنگ و بەسودی لێ تێدەگەین..

ئەو دروشمە ئەوە بوو:

Laissez Passer _ Laissez Faire

وشەی یەکەم:- Laissez Passer - مانای ئەوەیە: (( لێ گەڕێ، با ( بە ئارەزوی خۆی ) شت بکات )) ، وشەی دووەمیش:- Laissez Faier – مانای ئەوەیە: (( لێ ی گەڕێ با ( بە ئارەزوی خۆی ) بڕوات )) کێ شت دەکات؟ کێ دەڕوات.

ئەوەی ( بە ئارەزوی خۆی ) شت دەکات ئەوە خەلکە.. گەلە.. پیاوی شەقامە.. تاکە.. بە ئارەزوی خۆی شت دەکات، (( بە ئارەزوی خۆی )) _ بە

کاری ئاراستەی دارێژراو _ دەچێتە ناوی ئازادی بێ باوەری و، ئازادی بەدرەوشتی لەژێر ناونیشانی (( ئازادی کەسایەتی ))، کە دیموکراسیەت زۆر پێدادەگرێت لەسەر ئەمەو، دەیکاتە ئامانجێکی سەرەکی لە فەلسەفەکەیدا.

ئەوەی ( بە ئارەزوی خۆی ) دەڕوات، سەرمایەیە. کە هەموو بەربەستێك لەپێشی خۆی لادەبات، بۆ ئەوەی قازانجەکەی چەند جارە بکاتەوە، بەبێ گرنگی دان بەهەر هۆکارێك دەیگرێتەبەر، بەبێ گوێدان بەکاردانەوەی ئەم شتە لەسەر خەڵك.. لەسەر گەل.. لەسەر پیاوی شەقام.. لەسەر تاك.. کە ئەم شتە جارێکیان دەبێتە خزمەتێکی ڕاستی بەسود، جارێکیش دەبێتە ڕوخاندنێکی گشتگیر لە دەرونەکان و ڕەوشتدا.. بەڵام لە حاڵەتێکدا هەر سەرمایە قازانجی هەرە گەورە دەکات، بەڵکو زۆر جاریش تاکە قازانج هەر خۆیەتی!

بەم شێوەیە حەق و ناحەق لەم دیموکراسیەتە تێکەڵ دەبێ، جاری وا هەیە حەق و ڕاستی سەردەکەوێ، بەڵام ناحەق چەند جار سەر دەکەوێ..

با هەر شتێك بێت، بزانین جیهانگەری ( عولمة ) چیمان بۆ دەهێنێ، کاتێك چەپۆکی بەسەرماندا دەدات! ئایا شتە باشەکانمان بۆ دەهێنێ؟ یان شتە خراپەکانی؟!

*       *       *

سەبارەت بە پێش کەوتنی تەکنەلۆژی و زانستی بە ئەندازەیەك ڕێگای پێ دەدات کەوا (( زەرەرو زیان نەگەیەنێ بە بەرژەوەندیەکانی )) بەڵام (( نهێنیە )) سەرەکیەکان، کە پێش کەوتنی ڕاستەقینەی لەسەر دادەمەزرێ، ئەوا تایبەتە بە

خۆی و لیّ ناگەڕیّ کەس ببیّتە خاوەنی، بۆیە دەبینی زۆر لە زانای ئەتۆم لـە کـوڕ گـەلانی جیهـانی سـێهەم _ ئیـسلامی بـە تایبـەت _ کـوژراوە (( لـە چـەند بارودۆخیّکی نادیاردا! )) یان فڕۆکەکەی لە ئاسمان تیّك شـکاوە! یـان هـەر نـەبیّ کراوە بۆ ئەوەی خزمەتی بەرژەوەندی ئەو وڵاتە بکات، کە بەکاری دەهیّنیّ!

ڕاستە ئەگەر لەو زانایە بگەڕابان سەربەست بیّت، ئەوا خۆی و زانستەکەی دەفرۆشیّت، چونکە وڵاتەکەی خـۆی ئـاوڕی لیّ ناداتـەوە و هـانی نـادات لەسـەر توێژینەوە و زانست و، شارەزاییەکەی وەبەرهەم ناهیّنـیّ.. بـەڵام ئەمـە وە نـەبیّ خراپی مەرام و نیەتی ئەوان ڕەت کاتەوە، ئەویش یـان دەبـیّ ئـەو زانایـە هیّـز و توانای بۆ بەرژەوەندی ئەوان بیّنیّتە بەرهەم، یان دەبیّ لە زەوی دا نەمیّنیّ!

سەبارەت بە گەندەڵی ڕەوشتی و ڕۆحی ئەوا چی لیّ وەردەگری وەری بگرە. بەڵکو ئەمە لە حەقیقەتی واقیعـدا دیـارترین و زەق تـرین ڕووی جیهانگـەری (( عولـمـة ))یـە.. کـە هـەموو ڕۆژ بنـچینەکانی جیّگیرتـر دەکـات لـەو کەناڵـە ئاسمانیانەی، کە هەموو شتەکی کەم و نزم و قیّـزەون پـەخش دەکـات.. واش لـە پرۆگرامەکانی فیّربوون دەکەن، کە هەموو ئەو شتانەی پاریّزگاری لـە بنـەماکانی خودی ئومەت دەکات لە ئایین و ڕەوشت و نەریتەکان و بنچینەکان، دەری بیّـنن و لای ببەن، هەروەها چەند کۆنگرەیەکیش گریّ دەدریّن بۆ بڵاوکردنەوەی یاخی بوون فەرمانەکانی خوا بـە ئاشـکرا، کـە بڕیارەکـانی ئـەم کۆنگرانـە بەسـەر خـەڵکی دەسەپیّنریّت، سزای نەیارانی دەدریّت بەبیّ بەش بوونی لە (( بەزەیی )) سـندوقی نەختی دەولی، یان جگە لەمانە لە دام و دەزگاکانی چەوسانەوەو کۆیلە کردن!

بەڵام ئەو (( دیموکراسیەتەی )) (( هەژارەکانی )) جیهـانی سـێهەم دڵیـان

پێ خۆشەو چاوەرێ دەکەن، ئەوانەی دەناڵێنن لە ژێر سیستەمی سەرکوت کەری سیاسی ئەوەش بە هەمان شێوە دەچێتە ناو یاریەکەوە!

بەڵام Laissez Faire (( لێ ی گەرێ با بە ئارەزوی خۆی شت بکا ))

بێ باوەڕی دەکا کەللەرەقی دەکا، خراپە دەکا، کەلەپور لەناو دەبا، شتە نەگۆڕەکان تەفرو تونا دەکات، ئەمە لە دیموکراسیەتی هاوردەدا دەرگاکانی لەسەر پشت دا بۆ دەکرێتەوە، خەڵکیشی بە هەموو هۆکارێک لەسەر هاندەدرێ.. هۆکارەکانی ڕاگەیاندن، بەرنامەکانی فێربوون و، هەروەها ڕووت کردنەوەی ئافرەت لە شەقام و چایخانە و کەنار ڕوبار و نوسینگەو.. کۆڕو کۆبونەوەکان!

بەڵام مافەکان و دەستە بەرەکان ( الضمانات ) _ کە بەنرخترین شتە لەناو دیموکراسیەت _ ئەوە نابێ بۆ جیهانی سێهەم ڕەوانە بکرێ.. چونکە تایبەتە بە پیاوی سپی.. چونکە ئەگەر ئەو ماف و دەستەبەرانە لە جیهانی سێهەم شین بێت، ئەوا ئازاد دەبێ و قەوارەو بونە لەدەست چوەکەی دەگەڕێنێتەوە، لە کۆتایشدا بەربەرکانێی جیهانگەری ( عولمة )دا دەکات، کە د بۆ تاغوتی جیهانی دەیچەوسێنێتەوە.. کەواتە با شانۆگەریەکەی وەرگرن و یاری پێ بکەن.. بەڵام ڕاستیەکەی بەدور دەزانرێ بەدەست بهێنرێ!.

*        *        *

باشە ئەگەر کارەکە ئەوها بێت، سەیرە بۆ کۆمەڵە ئیسلامیەکان، خۆیان ناوەتە ناو قاڵبی جیهانگەری ( عولمة ) یان قالبی دیموکراسیەت، گومان دەبەن بەو کارەیان زەمینەیەکی نوێ بۆ خۆیان وە دەست دێنن، یان رزگاریان دەبێ لەو ئابڵوقەیەی، کە کراوەتە سەریان؟!

ئایا پاش ئەو هەموو ئەزموونانەی ڕابورد، دەبێ فڕوفێڵەکە هەر بمێنێ؟!

ئایا نایەتە بیریان،کە ئەمریکا خاوەنی جیهانگەری ( عولمة )یە _ یان ئەو جولەکانەی کە هەڵیدەسوڕێنن _ کە هەر ئەوانە ئەو حکوماتانەیان لە جیهانی ئیسلامیدا چاندوە، کە سەریان دەبڕن و دەیان کوژن و دەریان دەکەن و گەنجەکانیان دەهاوێنە ناو بەندیخانەوە؟

باشە چ گۆڕانکاریەك لە نەخشەی ڕووداوەکان دا ڕوو دەدات، کاتێك ئێمە پەیرەوی دیموکراسیەتی فرە لایەنی بکەین و بیکەینە دروشمێك و ئاشکرای بکەین و، هاواری بۆ بکەین و، پاڵپشتی بکەین و، سوێندی گەورەو پیرۆز بخۆین، کە ئێمە بەدوای دەکەوین؟!

ئایا ئەمە هیچ لەو مافە زەوت کراوانەو دەستەبەر کراوە ویستراوەکانمان بۆ دەگەڕێنێتەوە؟ ئایا هەر خاوەنی جیهانگەری ( عولمة ) نیە ئەو حکومەتانە هان دەدات بۆ بەرگری کردن لە تەیاری ئیسلامی و خەفە کردنی و هەوڵ دان بۆ لەناو بردنی؟! چ شتێك دەگۆڕێ، کاتێك ئێمە ئاشکرای بکەین، کە دیموکراسیەتی فرە لایەنین؟! ئەدی کوانێ دەرئەنجامەکانی ئەزمونی جەزائیر و حیزبی رەفاە لە تورکیا ؟!

ئێمە بانگەشەی توندو تیژی ناکەین.. پڕ بەدەممان ڕادەگەیەنین، کە ئێمە بە ڕەوای نازانین و، واش نازانین کە سود بە بانگەواز بگەیەنێ، بەڵکو دەڵێین توندو تیژی پێچەوانەی بەرنامەی پێغەمبەرەوە، زیانی بۆ بانگەواز هەیە و سودی پێ

ناگەیەنێ[1].

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەڵێین فەرمان ڕەوایی کردنی شەریعەتی خوا، خوا پێویستی کردووە، نابێ مرۆڤ وازی لێ بێنێ و ڕووی لێ وەرگێڕێ، ئەگەر بیانەوێ مسولمانبن: ﴿فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا: بەڵام نەخێر سوێندەکە بە پەروەردگاری تۆ ئەوانە نابنە خاوەنی بڕوا مەگین وەختێ لە کێشەو هەرای نێوان خۆیانا بتکەنە قازی و لە دڵەوە بە هەر فەرمانێ تۆ بیدەی ڕەوایان بێ و بە تەواوی مل کەچی بن﴾ نساء:٦٥.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ...: ئەگەر فەرمانێ خواو پێغەمبەرەکەی فەرمانیان بەهەر کارێك دا، هیچ پیاوێك و هیچ ژنێکی خاوەن باوەڕ ناتوانن پەسەندی نەکەن﴾ الاحزاب:٣٦.

وەنەبێ لە نێوان ئێمەو دیموکراسیەت _ وەکو ڕێکخستنێکی سیاسی _ دژایەتیەك هەبێت، بەڵکو دژایەتیەکە لەلای ئەوانە، چونکە ئەوان پابەند بوون بەفەرمان ڕەوایی شەریعەتی خوا ڕەت دەکەنەوە! ئایا بارو دۆخەکە وای لێ هاتووە بۆ هەر بزوتنەوەیەکی ئیسلامی، بارو دۆخێك قەبول بکات، کە تیایدا فەرمان ڕەوایی شەریعەتی خوای ڕەت بکرێتەوەو، شەرعیەتی بوونی پێ ببەخشێ؟! جا کاتێك دەست لەم پێویستیە خواییە، لە ئیسلام چمان بۆ دەمێنێتەوە؟! یان کاتێك دەست هەڵناگرین و _ ڕێگە چارەیەکیشمان نی یە بۆ

1 / ئەگەر دەتەوێ تەماشای کتێبی ( واقعنا المعاصر ) و کتێبی ( کیف ندعوا الناس ) بکە.

دەست هەڵنەگرتن _ ئـەوا دیموکراسـیەت ڕەتمـان دەکاتـەوە، بـا هـەزار سـاڵیش خۆمانی بۆ ببەینە پێشەوەو مەرایی بۆ بکەین!!

پاشان لێرەدا گومانێك پێویستە ڕون بکرێتەوە!

ئەو دیموکراسیەتەی _ کە لایەنە ئیجابیەکانی لەدەسـتەبەریی و مافـەکان _ دەزگایەك نیە هاورد بکرێ و بە دائیرەی کارەبایی ببەسترێ، پاشان لـە خـودی خۆیەوە مافەکان و دەستەبەرەکان ( الضمانات )مان بۆ وەبەرهەم بێنێ!

بەلانی کەمــەوە ئـەو دیموکراسـیەتەی، کـە ڕۆژئـاوا تـام و چـێژ لـە شـتە باشەکانی وەردەگرێ ( جارێ لە شتە خراپەکانی گەڕێ ) ، بلانی کەمەوە تەمەنی دووسەد ساڵە، لە تێکۆشانی نەپچراو کـە گـەل لـە پێناویـدا هـەولیان داوەو زۆر قوربانیان پێش کەش کردوە لە ڕۆڵەکانی، کـە کـوژراون، دەرکـراون، بەنـدکراون، بەهەموو هۆکارێکی جـەنگ، جـەنگیان لەگـەڵ دا کـراوە ، هـەتا لـە کۆتاییـدا توانیتیان مافەکان و دەستەبەرەکان بە دەست بێنن، کـە دیموکراسـیەت لـە خـۆی گرتووە، ئەگەرچی قەت نەیان توانیوە بەسەر شتە خراپەکانیدا زاڵ بن، چـونکە _ لەلای ئەوان _ دیموکراسیەت یەك دارشتەیە، کە ڕاستی و ناڕاستی تێکەڵ بووە.

ئایا ئێمە دەگەینە ئەو مافو دەستەبەرانەی، شتانەی کە ئەوان گەیـشتونێ گەر تەنها ڕاییگەیەنین ئێمە دیموکراسین؟! یان دەبێ ئەم ئومەتە پەروەردە بکرێ بۆ ئەوەی پارێزگاری لە مافەکانیدا بکات و دەست درێژی کـردن لەسـەرە خـۆی ڕەت بکاتەوە هەروەکو ئومەتەکانی تر پەروەردە کران، لە میانەی تێکۆشان و خەبات و قوربانیدانیان گەیشتنێ ؟!

ئەگەر ئێمە نەتوانین دەست بەرداری پەروەردە بـین، کـە کـارێکی مانـدوو

کەرو درێژ خایەن و پر هیلاکیە. بەرو بومەکەی درەنگ پێ دەگا، ئەگەر چی کاریگەریەکەی یەکاو یەك و مسۆگەرە، جا ئایا بۆ ئێمەی موسوڵمان شایەنە، کە وزەو توانامان لە پەروەردە کردن لە شتێك دا بخەینەگەر، کە حەق و ناحەقی تێکەڵ بووە، یان دەبێ لە شتێك بەکاری بێنین، کە ناحەقی ناتوانێ تێکەڵی بێ، نە لە ڕوبەڕو نە لە پاشملە، ئەویش ئیسلامە؟!

ئێمە لە هەردوو حاڵەتدا کۆشش دەکەین و، ئارامیم لەسەر شتە ناخۆشەکانی دەگرین، بەڵام ئێمە لەیەك لە حاڵەتەکان، لەزەت و چێژی دونیا بەدەست دێنین ( کە پۆخڵەواتە ) و، بەڕوو وەرگێڕان لەشەریعەتەکەی تووشی تووڕەیی خوا دێین. بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا تام و چێژی دونیا و ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست دێنین: ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُم فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا...: خوا لەوانەی بە ئێوە بڕوایان هەیەو ئاکار چاکن، بەڵێنی دا: لەم زەمینەدا دەیانکاتە جێگە نشین؛ هەروەکی چۆن ئەوانی بەر لەوانی کردە جێ نشین، دینەکەشیان _ کە خۆی پەسەندی کردوە _ هەر بۆیان دادەمەزرێنێ و ترسەکەشیان بۆ دەکاتە دڵنیایی { تا } تەنیا من بپەرستن؛ هیچ شتێکیش بە شەریکی من نەزانن﴾ نور:٥٥.

﴿ تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَذَلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ

ئەم دەستورانە سنورن خوا داینـاون. هەر کەسێکی بەر فەرمانی خواو

پێغەمبەرەکەی بێ، دەینێرێتە ناو باغتێك جۆ باریان بەبەردا دەڕواو هەتا سەر هەر تیایدا دەژین و لەو پەری بەختەوەری دان﴾ نساء: ١٣.

بەڕاستی بزاڤی ئیسلامی خاوەنی زۆر شتە...

لە باتی ئەوەی خۆی بنێتە نێو ئەو قاڵبەی، کە دوژمنەکانی دەیانەوێ بیکەنە ناویەوە، کە بەم کارەیان فێڵ و تەڵەکەی دوژمنەکەیان زیاتر چەوسپاو ترو جێگیرتر دەکەن.. لەسەریەتی لەباتی ئەمە جێگرەوە(بدیل)ێکی ونبوو دەربخات و، سیستەمێکی جیهانی ڕاستیش نمایش بکات.

ئیسلام سیستەمێکی جیهانی ڕاست و دروستە. ئەنجا چ بۆ ئەوانەی پەیڕەوی دەکەن یان (( ئەوانەی ))تر کە نەهاتونەتە ناو ئیسلام.

ئەگەر بێتو مۆرك و نیشانەی هەر زەق و گەورەی جیهانگەری ( عولمة ) ڕق و قین و فشار خستنەسەر بێدەسەڵاتان بێت بۆ ئەوەی سەر شۆڕی دەسەڵاتی ئەوبن. ئەوا نیشانەو مۆرکی هەرە گەورەی ئیسلام ئەوەیە، کە زۆر لەکەس ناکات بێتە ناو ئیسلام: ﴿لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ...: لەم دینەدا بەزۆر داسەپاندن نیە﴾ بقرة: ٢٥٦.

﴿...أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ: ئایا تۆ دەتەوێ بەزۆر ئەم مەردمە بڕوا بێنێت﴾ یونس: ٩٩. ئەگەر نیشانەی دیاری جیهانگەری ( عولمة ) سەپاندنی قاڵبێکی دیاری کراو بێت بۆ ژیان _ کە قاڵبی ئەمریکیە _ بۆ ئەوەی خەڵکی بەزۆری بکرێنە ناو ئەو قالبەوە، ئەگەر پێوانەو قیاسی ئەوان نەگونجا لەگەڵ قالبەکەی ئەوان، ئەوا لە قالبدرانەکەیان دەکرێت بە بڕینی هەندێك لە ئەندامەکانیان، یان شکاندنی، ئەوا ئیسلام _ ئاینی خوایەو _ دان بەجیاوازی (

اختلاف )دا دەنێت، کە کارێکی واقیعەو خوای گەورە فەرزی کردۆتە سەر مرۆڤ بە دانایی و حیکمەتێك کە خۆی دەیەوێ: ﴿ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ، إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ...: پەروەردگاری تۆ ئەگەر حەزی بکردایە خەڵکی دنیای گشت دەکردە یەك ئاین، بەڵام بە ناتەبایی هەر دەمێنێتەوە. { جا } مەگین پەروەردگاری تۆ بەزەییی پێدا بێتەوە، هەر بۆیە دروستی کردون﴾ هود: ١١٨، ١١٩.

ئیسلام موسوڵمانان پابەند دەکات بەچەند نەگۆڕێکی دیاریکراوو چەند پێوانەیەکی دیاری کراو، کە خوای زاناو کاربەجێ دەزانێ بۆ دروست بوونی مرۆڤی چاك پێویستە ، کە شایەنە ببێتە جێنشین لە زەوی: ﴿ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً...: ئەو کاتەی پەروەردگاری تۆ بە فریشتانی ڕاگەیاند؛ من دەمەوێ بریکارێك لەسەر زەمین دیاری بکەم﴾ بقرة: ٣٠.

﴿ يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُم بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ اللَّهِ...: ئەی داود: جێ نشینمان لەسەر زەمین دا بە تۆ، بە تەرزێکی خودا پەسەند، بەکاری مەردەم رابگەو شوێن ئارەزوی خۆت مەکەوە، کە لەرێی خودا لات بدات﴾ ص:٢٦.

بەڵام ئیسلام _ هەتا لەگەڵ موسوڵمانانیش دا _ نایانکاتە چەند دانەیەکی لەیەك چوو و دووبارە کراوە وەك ئامێرەکان، بەڵگەی واقعیش لەسەر ئەمە جیاوازی نێوان مەزهەبەکان جیاوازی ڕاو بۆچونەکانە، کە ئەم ئومەتە هەر لە ڕۆژی یەکەمیەوە دانی پێداناوە، کە ئەم جیاوازیە نە ئیسلامی تەنگ کردتەوە، نە لەسەر موسوڵمانانیش تەنگ بووە، بەڵکو لەسەر ئەوانە تەنگ

دەبێتەوە، کە لە شتە نەگۆڕەکان ( الثوابت ) دەردەچن بە بیانوی ئازادی کەسایەتی، یان بە بیانوی ئیجتیهاد، یان جگە لەم بیانوانە.. بۆ ئەوەی لە دین رابکەن.. ئەمانە خوای گەورە بڕیاری لەسەر داون، کە لە ئایین هەڵگەڕانەوە.

بەڵام جگە لە ناموسوڵمانەکان، ئەگەر کاتێك لەسەر زەوی ئیسلام و لەژێر ئالای ئەودا بژین، ئەوا ئەوەی بۆ ئەوانە بۆ ئێمەشە، هەروەها ئەوەی لەسەر ئەوانە لەسەر ئێمەشە بەڵام کاتێك لە دەرەوەی سنوری دەسەڵاتی ئیسلام بن ئەوانە گەر شەڕ خوازبن شەڕیان لەگەڵ دەکرێت، ئەگەریش ئاشتی خوازبن، ئەوا پەیمانیان لێوەردەگیرێت و بە دادگەری مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت: ﴿ لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ، إِنَّمَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ قَاتَلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ وَظَاهَرُوا عَلَى إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ: خودا بەرتان لێ ناگرێ کە ئێوە دەگەڵ ئەوانەی بەگژ ئێوەدا نەچوون و لە زێد وەدەریان نەناون، چاکەیان دەربارە بکەن و بە یەکسانی ڕەفتاریان دەگەڵدا بکەن. خوا مرۆی خاوەن ئینسافی خۆش گەرەکە. تەنیا هەر ڕێگەتان نادا دەگەڵ ئەوانە ببنە دۆست کە لەسەر دین، شەڕیان دەگەڵتانا کرد و ئێوەیان لە زێدی خۆتان ئاوارە کرد. لەسەر دەرکردنی ئێوەش، بوونە پشتیوانی یەکتر. هەر کەسیش ببێتە دۆستیان، دیارە غەدرێ لە خۆ دەکا﴾ ممتحنة: ٨_ ٩.

ئەگەر دەرئەنجامی ڕاست و دروست و کۆتایی جیهانگەری ( عولمة ) ئەوە بێت، کە هەژارەکان بکاتە بەندەو کۆیلە بۆ دەسەڵاتی خۆی، ئەنجا لەژێر هەر ناونیشانێك یان هەر بیانوەك بێت، ئەوا ئیسلام وای لە عومەر کرد _ ڕەزای

خوای لەسەر بێ _ بە یەکی لە کاربەدەستەکانی بڵێ: ﴿ یا عمرو! متـی استعبتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احـرارا: ئەی عـەمر: تاکەی خەڵکی دەکەنە کۆیلە، لـە کاتێك دا بە ئازادی لە دایك بوون﴾؟!

بەر لە ئەوە هەموو شتێ، یان لەسەروی هەموو ئەوانەوە ئەگەر جیهانگـەری ( عولمة ) بۆ خەڵك دێنێ، کە لە (( کۆنگرە! )) نێو دەوڵەتیەکانی جیهـان بریاریـان لەسەر دراوەو سەپاندویانە لەبێ باوەڕی و بێ سەروبەری جنـسی و لابـەلایی و، لا ڕێبون.. ئەوا ئیسلام زۆر موکڕەو سورە، کەوا گیان و ڕەوشتی خـەڵکی لـەپیس و پۆخڵ و نگریسی پاك بکاتەوە، بۆ ئەوەی بەرز ببنەوە بۆ ئەو ئاستەی، کە شایەنی (( مرۆڤە )).

بەڕاسـتی پـێش کـەوتنی زانـستی و تەکنـەلۆژی و ڕێکخـستنی هـیچ پەیوەندیەکی بە تێك دانی ڕەوشت و ئەخلاق دا نیە.. بەڵکو پێداویستیەکانی ئەم پێشکەوتنەش نیە، کە ڕەوشت و ئەخلاقی خەڵکی تێك بچێ و نـزم ببێتـەوە، تـا بێنە تەك ئاستی ئاژەڵ هەروەکو، کە ئێستا (( لە شارستانیەتی )) ڕۆژئاوا! رووی داوە! _ بەڵکو ئەمەی لەلای ئەوان ڕویدا هەروەکو، کە لەمەو پێش باسمان کرد _ لەبەر چەند بارو دۆخێکی ناوچەیی تایبەت بە خۆیان بوو، کە لە ژیانیاندا ڕویـدا، کە ئەم بارو دۆخە تایبەتە ناکرێ بکرێن بە خەسڵەت و خویەکی گشتی و هیچ لەو ڕێسایانەش نیە، کە نەگۆڕێن و لادان هەڵنەگرێ!

ئیـسلام کاتێـك خـەڵکی دەسـتی بـەڕوە جـوان و ڕاسـتەکەی گرتبـوو _ شارستانیەتێکی بەرز و بەهاداری بەخـشیە مرۆڤایـەتی لـە هـەموو لایەنـەکان و بوارەکان، بێ ئەوەی ڕەوشتی تێك بچێت و شکـست بێنـێ لـە لایـەنی ڕۆحـی..

بەڵکو کۆمەڵگای ئیسلامی کەمترین کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بووە، کە روو بچێتە ناو تاوان، کەمترینیان بووە لە ئارەق خواردن و بەردەوام بوون لەسەر ماددە سرکەرەکان، کەمترینیان بووە لە تاوان و تاوانکاری، زۆر ترینیشیان بووە لە نوێژ کردن و پەرستنەکان، زۆرترینیان بووە لە پێك بەستنەوەی شیرازەی خێزان، زۆرترینیان بووە لە سازدانی بارودۆخێکی پڕ ئارام و ئاسایش، زۆرترینیان بووە لە خێرو بەرەکەت !

* * *

ئەمڕۆ ئیسلام _ بەڕوە ڕاستەقیتەکەی لە نێو موسوڵمانانداندا نابینینەوە، مەگەر لە چەند کەسانێك دا نەبێت، کە بە بڕوایەکی هۆشیارانە بە حەقیقەتەکەی ڕەفتاری پێ دەکەن. بەڵام ئەو کەفەی پێغەمبەرﷺ هەواڵی پێداینە _ بە چاو پۆشین لە جێگەی لە حوکمی خودادا(ئەمە مەسەلەیە کە خۆمانی لێ نادەین ) _ ئیسلام نامۆو غەریب بووە لەلای هەروەکو کە پێغەمبەری ڕاست گۆ ڕایگەیاندووە: (( بدأ الاسلام غريبا و سيعود غريبا كما بدأ، فطوبى للغرباء[1]: ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکردوە، هەر بە نامۆیش دەگەڕێتەوە، مژدەو ئاسودەیی بۆ نامۆیەکان)).

ئەرکی نامۆیەکان ( الغرباء ) _ هەروەکو، لە ڕیوایەتی ترمذي دا _ هاتووە ئەوەیە، کە: چاکسازی بکەن لەوەی خەڵکی لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ خراپیان کردوەو گۆڕیویانە.

ئەمەش کاری بزاڤە ئیسلامیەکانە.

---

١٣ / ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردوە.

ئەرکی ئەوە نیە خۆی بنێتە نێو قالبی جیهانگەری ( عولمة ) بۆ خاتری ئـەوەی بژی! ئەمە بانگەشەی دوژمنەکەیەتی بۆ ئەوەی لە کۆتاییدا لەناوی بـەرن و لێـی ڕزگار بن!

ئیسلام بۆ ئەوە نەهاتۆتە خـوار لەگـەڵ لادان و خراپـەی مرۆڤـدا ڕێ بکـات، بەڵکو بۆ ئەوە هـاتووە ڕاسـتی بکاتـەوە و بەسـەریدا زاڵ بێـت: ﴿ وَأَنزَلْنَـا إِلَيْـكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَـا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ...: ئەم قورئانەشمان بـە خـەڵات بۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە، کە هەرچی تێیدایە ڕاستە، بـە کتێبـە بەرینـەکان بـڕوای هەیەو چاودێریانە ئیتر تۆ بە پێی ئەوەی خوا ناردویەتیە، بە کارو باریـان ڕابگـەو بەلادان لەو هەقەی کەوا بۆت هاتووە، مەکەوە شوێن ئاوات و ئـارەزوی ئـەوان ﴾ مائدة: ٤٨.

خەڵکی بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە ئیسلامێکی ڕاست و دروست یان نزیکە لەو ڕاست و دروستیە ئەوا پێویستیان بە تێکۆشانێکی پڕ مەینەتی هەیـە بـۆ ئـەوەی بخرێنـە گـەر بـۆ پـەروەردە کـردن لەسـەر ئـەو ئیـسلامە ڕاسـت و دروسـتە.. تێکۆشانێکی پڕ مەینەت و نارەحەت و پڕ هیلاکی و درێژ خایەنی گەرەکە، بـەڵام کاریگەریەکەی یـەکاو یـەك و مـسۆگەرە، ئەگـەر چـی تـەواو بوونەکـەی چـەند نەوەیەکیش بخایەنێ.

ئەم ئومەتە.. بە بڵـاو کردنـەوەی کتێبێـك یـان چـەند ئامۆژگاریـەك، یـا بەچەند وتارێکی بەگڕو تین لەسـەر شـتە باشـەکانی ئیـسلام، لەسـەر حەقیقـەتی ئیسلام پەروەردە نابێ ئەگـەر چـی هـەموو ئەمانـە لـە ئـامڕازە پێویـستیەکانی

بانگەوازە.

بەڵکو خەڵکی بە پلەی یەکەم بەهۆی پێشەنگیەوە پەروەردە دەبێ، پاشان بەو ئاۆمۆژگاری و ڕێنماییانەی، کە لە پێشەنگەکەوە دەردەچێت، کە دەنگ و سەدای لە دڵ و دەروونەکاندا بۆ پەیدا دەبێت کاتێك ئەو پەندو ئامۆژگاریانە لە کەسێکی خاوەن دڵ و دەروونێکی بڕوادار و ڕاستە قینەوە دەردەچێت، کە دڵ و دەروونێکی پابەند ( ملتزم ) بێت، لە واقیعی کاری ڕۆژانەشدا باوەڕ هێنانەکە ڕەنگ دانەوەی هەبێت و بە ڕۆشن بینییەوە بانگەشە بۆ ڕێگای خودا بکات: ﴿قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ: بڵێ ئەمە ڕێگای منە؛ هەم خۆم و هەم ئەو کەسانەش شوێنم کەوتوون _ بە ڕۆشنبینییەوە _ بۆ خوا ناسی، بانگی دەکەم، خواش هەمیشە پاکەو تاکەو لەوانە نیم کە شەریکی بۆ خودا پەیدا بکەم﴾ یوسف: ١٠٨.

لەبەر ئەمە بزاڤە ئیسلامیەکان خودی خۆیان پێویستیان بەوە هەیە، کە لەسەر ڕاستی و پێوستیەکانی ( لا إله إلا الله ) جێگیرو چەسپاو بن بۆ ئەوەی بتوانن ئەزمونێکی زیندو و لەبەرچاو لە جیهانی واقیعدا بۆ خەڵکی بگوازێتەوە، تا خەڵکی ببینن و پەیڕەوی بکەن و شوێنی بکەون کاتێك ب بۆ لای انگ دەکرێن.. ئەمەش کە ناومان ناوە ((دامەزراندنی بنکەیەکی پتەو )) کە لەمەودوا بە بانگەوازی خەڵك هەڵدەستێ[1] ..

بزاڤە ئیسلامیەکان ڕێگایەکی ئاسان و خۆش نابیننەوە بۆ گەیشتن بەیەك لەم دوو ئامانجە، بەڵکو لەهەموو لایەك کۆسپ و ئاستەنگی دێتە پێش.. بەڵام

---

١٤ / ئەگەر دەتەوێ تەماشای کیتابی ( کیف ندعو الناس) بکە.

ئەوە قەدەری خوایە کە بۆی داناوە: ﴿ أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ؟،وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ: ئاخۆ مەردوم لایان وایە هەر کە بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە، ئیتر وازیان لێدەهێنرێ و تووشی هیچ ئەزمونێ نابن؟ ئێمە ئەوانەی بەر لەوانیشمان بە تاقی کردەوە. بێگومان خوا ئەوانەی کە ڕاستیان گوت، ئەوانەش کە درۆزنن دیاری دەکا﴾ عنکبوت: ٢،٣.

بەڵام ئامانجە ویستراوەکە هەندە گەورەیە بەجۆرێك، کە شایەنیەتی هەموو وزەو توانای بۆ بخرێتە گەڕ، لەسەروی هەمووش، پەرستنێکی بێگەردو پاکیشە بۆ خوا.

جا ئامانجەکە لە کۆتاییدا _ با تەواو بوونەکەشی چەند نەوەیەك بخایەنێ _ بە دیارخستنی نمونەیەکی شارستانی ڕاستە، بۆ ئەوەی خەڵکی لە تاریکاییەکان دەربێنێ بۆ ڕوناکی.. ﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ: دەبێ لە نێو ئێوەدا کۆمەڵێك بن، فەرمان بە چاکە بدەن و ڕێ لە خراپە ببەستن؛ هەر ئەوانەش ڕزگار دەبن﴾ ال عمران:١٠٤.



بەڕاستی ئەو نمونە شارستانیەی، کە ئەمڕۆ بەرپا فیتنەو ئاشوبێکی گەورە بۆ خەڵك دەنێتەوە.. چونکە پێشکەوتنی جۆراو جۆری تێدایە، کە هەندێکیان بەڕاستی سودی هەیە بۆ خەڵکی و، بۆیان پێویستە بۆ ئەوەی ئاستی ژیانیان بەرزکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا شکست و دابەزینی گیانی و ڕەوشتی تێدایە، کە خەڵکی دێنێتە خوار بۆ نزمتر لە گیانلەبەر.. خەڵکیش _ لەبەر دابەزینیان

مەگەر ئەوەی خوا بەزەیی پێدا هاتبێتەوە _ هەردوو شتەکە پێکەوە وەردەگرن، بەوەی، کە _ هەردووکیان _ لەگەڵ یەکن، دوو شتەکەش پێشکەوتن و پایەبەرزی و بەرزبوونەوەیە!! لەبەر ئەمە ئەم خەڵکە لەو کاتەی، کە شکستیان خواردوە هەست بە تێکشکاوی و نزمیاتی خۆیان ناکەن، بەڵکو وا گومان دەبەن، کە بەردەوامن لە ڕێگای بەرزبوونەوەدا مادەم هەڵدەستن بە ئەنجامدانی جۆرەها پێشکەوتن، کە ئەو شارستانیەتە بۆیان دەرەخسێنێ و ڕێگەیان بۆ خۆش دەکات..

خەڵکی لە شارستانیەتە لە نێوان خێرو شەڕ جوێ ناکرێتەوە ، بۆ ئەوەی پێش برکێ لە خێر بکەن و زیادی بکەن و، هەوڵی ڕزگاربوونیان بدەن لەو شەڕە، بە کیتابێك بڵاو بکرێتەوە، یان بە ئامۆژگاریەك، یان بە وتارێکی بەگڕو تین.

بەڵکو پێویستیان بەنمونەیەکی واقعی هەیە، کە خێرو چاکە لەو شارستانیەتەدا بێنێتە دی _ یان بەکەمی نەبێتە ئاستەنگ لە ڕێگایدا _ هەر لەو کاتەشدا لەلایەك پاك دەبێتەوە لەو پیسیەی، کە خۆی لە بێ باوەڕی (الالحاد) دەنوێنێ، لەلایەکی تریش خۆی دەنوێنێ لەفەوزای جنسی و لارێی(اغراف) و ڕیز پەڕی(شذوذ).. ئەنجا بە بەرچاو ڕونی و ڕێنمایی و، بە ڕەزامەندی و ئاسودەییەوە بە دوای نمونەکە دەکەون.

کاتێك ئەمە ڕوو دەدات مانای وایە مرۆڤایەتی بە تەواوی بەرز بوویتەوە، بەرزبوونەوەیەکی ڕاستەقینە، کە قەوارەی (( مرۆڤ )) دێنیتە دی.

ئەنجا ئەوانەی خاوەنی پەیڕەو(منهج)ی ڕاستن، هەر ئەوان مرۆڤایەتی ڕێنمویی دەکەن بۆ ئەم نمونەیە ڕاستە، کە ئەوانە ڕاسپاردراون بە گەیاندنی ئەم نمونەیە بە ڕاسپاردەییەکی تەواو؟!



بەرپەرچو وەلامدانەوەی ڕاستەقینەی ئەو تاغوتەی ئێستا، کە ناو نراوە جیهانگەری ( عولمة )، بریتیە لە بە دیارخستنی ئەو نمونە ڕاستەی، کە پێویستە مرۆڤ لەسەری بێت، بۆ ئەوەی خەڵکی لە جیهانی واقیعدا _ باوەڕ بکەن، کە دەکرێ مرۆڤ لە لایەنی زانست و تەکنەلۆژی و ئابووری و جەنگی و سیاسی پێش بکەوێ لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری مرۆڤایەتیەکەی خۆی بکات، پارێزگاری لە پاکیەکەی خۆی بکات، بەرز بێت لە شتە نزمەکان، پاك بێت لە پیسیەکان، دادگەر بێت، هەڵسەنگاندنی دادگەرانە بێت: ﴿ لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ...: ئێمە پێغەمبەرانمان نارد بە چەند بەڵگەی ئاشکراو وێڕای ئەوان، کتێب و هۆی هەڵسەنگاندنمان ناردە خوار، هەتا خەڵك بێ جیاوازی لەناو یەکا ڕەفتار بکات ﴾ حدید: ٢٥.

بەڵگە نەویستە، موسوڵمانان ناتوانن ئەو دواکەوتنەی لەلایەنی زانستی و تەکنەلۆژی و ئابووری هەیتیان و تێی کەوتونە لە ماوەی شەو ڕۆژێکدا تێپەڕێنێ، کاتێك کە کەوتنە ناو ئەو هەموو دواکەوتنە، هۆیەکەی ئەوا دوور کەوتنەوەیان بوو لە ڕاست و دروستی ئیسلام، ئەگەر موسوڵمانان ئەمڕۆش دەست پێ بکەن بۆ ئەوەی بەرەو پێشکەوتن بڕۆن _ ئەوا چەند نەوەیەك دەخایەنێ، بەردەوامیش جیاوازی لە نێوان پێشکەوتوەکان و دواکەوتووەکان هەر دەمێنێ، بەڵکو جیاوازیەکە هەر زیاد و فراوان دەبێت لەهەر بازدانێکی نوێ، کە زانست دەیهاوێ..

بەڵام ئەگەر هاتوو ملیاندا بۆ ئەو دەستەوەستانەیان و دابنیشن و دەست بەرداری گۆڕینی حاڵ و گوزەرانیان بن، ئەوا هەرگیز سەرناکەون!

با بزانرێ ئەو شتەی ئەمڕۆ مرۆڤایەتی پێویستی پێی هەیە زیاد کردنی بەرهەم هێنانی ماددی نیە، هەروەها زیاد کردنی بەرهەم هێنانی چەکە کۆکوژەکان نیە.. بەڵکو پێویستی بە شتێکە، کە زۆر لەوە گەورەترو بەسود ترە ئەویش: ئارامی دڵ و پاکی و بێگەردی ڕۆحە.

کاتێك موسوڵمانان ئەو نمونە ڕاست و واقیعیەیان پێش کەش دەکەن، لەگەڵ کارکردنی خێرایان بۆ رزگار بوون لەو دواکەوتنەی تێی کەوتونە، لەو کاتەدا موسوڵمانان خزمەتێکیان بۆیان پێش کەش کردوە، کە هاوتای نیە، چونکە هەر ئەمەیە قوتاریان دەکات لە روخاندن و وێرانکردن، لە هەمان کاتیشدا ئیسلام ئەو پێش کەوتنە ماددیەی، کە موکڕن لەسەری لێیان ناسەنێتەوەو نابات، چونکە ئیسلام هەرگیز دژی پێشکەوتنی زانستی و ماددی نەبووە، بەڵکو دژی ئەو کەم و کوریەیە، کە کاتێك ڕودەدات لە ژیانی مرۆڤ ڕودەدات کە خوایان لەبیر دەکەن و دوارۆژیان لەبیر دەکەن و ژیانی دنیایان خۆشتر دەوێت و جا کۆتایی کارو باریان _ بە گوێرەی سوننەتی خوا _ لەناو چون و وێران بونە..

* * *

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر ئەو پرسیارەی، کە دەستمان پێی کرد: موسوڵمانان چیان هەیە بەرامبەر ئەو تاغوتە ڕامالەی، کە ڕوبەڕویان دەبێتەوە؟

بەنیسبەت زۆری ئەو ئومەتە خاوەنی کزترین باوەڕن، ئەویش ڕق لێ بوونەوەو بوغزاندنی بەدڵە، کە ئەمە لەسەریان فەرزی عەینە، چونکە لەپاش ئەمە تۆزقاڵێك باوەڕ نامێنێ..

بزاڤی ئیسلامیش خاوەنی پرۆژەیەکی درێژ خایەنە، کە بەشی چەندەها نەوە

دەكات، بەڵام هەر لەوساتەوە پێویستە خۆی بۆ ئامادەو تەرخان بكات، كە ئەمە لەسەری فەرزی عەینە.. ئەمەش گێڕانەوەی ئەم ئوممەتەیە بۆ پەروەردەكردنی لەسەر ڕاستی و دروستی ئیسلام، بۆ ئەوەی نمونەیەكی شارستانی پێش كەش بكات، كە یارمەتی دەری خەڵكی بێت بۆ دەرچونیان لە تاریكیەكان بەرەو ڕوناكی.

## هەڵوێستی عەلمانیەکان

عەلمانیــەکان خۆشــحاڵی خۆیــان بــە ئاشــکرا بــۆ عولەمــە پیــشان دەدەن، ئارامیان نەماوە بە چاودێری کردنی، مژدە دەدەن بەخێرو خۆشیەکی گشت گیر، کە لە جیهانگەری ( عولمة )وە پێیان دەبەخشرێ، بۆ ئەوەی لە دواکەوتن دەرمـان بێنێ بۆ نوێ خوازی.. هەندێکیشیان خۆشی ئەوە ناشـارنەوە، کـە جیهانگـەری ( عولمـة ) (( پاشماوەی سەدەکانی ناوەڕاست لە ژیانمان )) بۆ لا دەبات، کـە هێـشتا پێمان هەڵواسراوە..

یان بە گوزارشتێکی تر، ئیسلامیان بۆ لا دەبات!!

بەم جۆرە بیردەکەنەوە.. بەم جۆرەش خەون دەبینن..

بەڕاستی مرۆڤ سەری سـور دەمێنـێ لـەو شـێوە گـۆڕاوە، کـە بـە چـاوی کەسانی تر مێژوی خۆی دەخوێنێتەوە، هەروەها بـە تـەرازوی کەسـانی تـر خـۆی دەکێشێ، هەروەها خۆی لە دەست دەدات وای لێدێت هەر دەڵێی ئەویش نیە!

سەدەکانی ناوەڕاست لە ئەوروپا، سەدەی تاریکایی بوون.. ئـەم تاریکیـەش بەسترابۆوە _ بە نەفامی _ بە ئـایین، ئەگـەر ئـایین بـێ! جـا وتـرا ئـەوروپا لـە تاریکایی دەژیا، چونکە لەژێر سێبەری ئایین دا دەژیا، کاتێك ئایینی فڕێدا پـێش کەوت و پایە بەرز بوو و لە تاریکایی دەرچوو بەرەو ڕوناکی..

ئێمە دەزانین، کە چەرخی دینداری لـە ئـەوروپا چـەرخی تاریکـایی بـووە، کاتێك ئەوروپا پێش کـەوت ئـایینی فڕێـدا. بـەڵام ئێمـە شـایەنترین، کـە دیـدو بۆچونێکی ئاشکراو ڕوغان هەبێت بۆ ئەم مەسـەلەیە بـەو پێودرانـەی، کـە ئێمـە هەمانەو ئەوروپا نیەتی. هەروەها لەبەر ئەوەی ئێمە لە دەرەوەی بازنەکە دایـن _

یان لە دەرەوەی قەیرانەکە داین _ بە دیتنێکی گشتگیرو تواناتر دەڕوانینە مەسەلەکە، کە ڕەنگە ئەوانەی لەناوی دان بەم جۆرە نەتوانن بیبینن، ئەوانەی کەوتونەتە ژێر کاریگەری کارو کردەوەکانی و، ئەوانەی کەوتونەتە ژێر فشارو هەڵچونوکانی، کە ڕەنگە دیدو بۆچون دابپۆشێ و گەندەڵی بکات.

بەڕاستی ئەوروپا هەتا ئێستا لە ئەزمون و تاقیکردنەوەی خۆی، ئاینی خوای نەناسیەوەو! بەڵکو ئاینێکی ناسیوە، کە چەند بیروبۆچونێکی مرۆڤی گومڕا دروستی کردوە، کە ئەوەی خراپی کرد خراپی کرد، پاشان ئەوەی پێی خراپ کرد پێی خراپ کرد!

هەروەها قەوارەیەکی جادو گەریانەی داهێنراوی نوسیوە، کە لە لایەن خواوە نەناردراوە، جا کاتێك هەلی بۆ ڕەخسا لەسنور دەرچوو و زۆرداری کرد، هەروەها لەسەر خەڵکی لەسنور دەرچونی گیان و لەسنور دەرچونی سامان و لەسنور دەرچونی عەقڵ و لەسنور دەرچونی سیاسەت و لەسنور دەرچونی زانستی سەپاند، کە ژیانی کردە دۆزەخێك، کە کەس بەرگەی نەگرێ، لەگەڵ ئەوەی ئەوروپا نزیکەی دە سەدە بەرگەی گرت ، پەی بەوە نەدەبرد، کە ئەم ئاینە چەند ساختەیی تێدایەو چەند ستەم کردنی تێدایە ئەگەر دوای ئەوەی لەگەڵ ئیسلام و موسوڵمانان تێکەڵ بوو ئاشنایەتی لەگەڵ کردن، هەروەکو کە لە بەندی پێشو ئاماژەمان پێی کرد.

ئا لەو کاتەدا ئەوروپا بە گۆشەی سەدو هەشتا پلەی تەواو وەچەرخا.. مرۆڤی کردە خواو لە جیاتی خوا پەرستی، کەوتە ناو ژیانی دونیا لە باتی ڕوکردنە دوا ڕۆژ، عەقڵی کردە حەکەم لەهەموو کارو بارەکان لەباتی گوتەکانی

ئایین ئەو گوتانەی کلێسە بەناوی ئایین گوتویەتی..

ئەوروپا ئازاد و سەربەستە لەوەی چ بە ئایینەکەی خۆی دەکا!

بەڵام دیدو بۆچوونی ڕاست و دروست، کە نەکەوتبێتە ژێر کاریگەری و سۆز و هەڵچونەکانی جەنگ.. دیدو بۆچوونی (( عەقڵانی )) دروست.. دیدو بۆچوونی (( زانستی )) سەقامگیر، دەبوایە لە هۆکار و دەرئەنجامەکان بکۆڵێتەوەو شیان بکاتەوەو تێیان بڕوانێت بۆ ئەوەی ڕاستیەکانی شتەکە ئاشکرا بکات، کە ڕەنگە هەڵچون یاخود حەزی تۆڵە کردنەوە لە جەورو ستەمی کلێسە بزریان بکەن.

هەر لە خودی ئەو ماوەیەی ئەوروپا لە تاریکایی دەژیا، هەر لەوکاتەوە ڕوناکیەکی تروسکەداری درەوشاوەو هەڵقوڵاو لە ئایین هەبوو.. بەڵام لەو ئاینە ڕاستەکەی، کە بیرو بۆچوونی پرو پوچ تێکی نەدابوو، نە جادوگەری هەبوو نە پیاوانی ئایین، کە بە حەزی خۆیان بەسەر خەڵکیان دەسەپاندو، کاتێک زەرەریان بکردبایەوە بە زیندویی دەیان سوتاندن!

حەقە باس بکەین _ هەروەکو لەمەو بەر باسمان کرد _ کە ئەوروپا نزیک بوو بێتە ناو ئەو ئایینە، ئەگەر توندو تیژی کلێسە نەبوایە لە دژایەتی کردنی، هەروەها دژایەتی کردنی ئەو کاریگەریانەی، کە بەسەر دەرون و هزرو بیری ئەوروپاییەکانی هەبوو.

بەڵام بەهەرحاڵ دەرئەنجامی کۆتایی بێت ئەوە بوو، کە ئایین بە تێکڕایی فڕێ بدرێ و دوور بکرێتەوە لە باڵ کێشانی بەسەر واقیعی ژیاندا، یان _ لە باشترین بواردا _ سنوردار بکرێ، هەتا وای لێدێت دەبێتە پەیوەندیەکی تایبەت

لە نێوان بەندەو خودا، کە جێگایەکەشی دڵەو، هیچ پەیوەندی نیە بە واقیعی ژیانی سیاسی، یان ئابووری، یان زانستی، یان ئەخلاقی، یان هزری، یان کۆمەڵایەتی....هتد.

جارێکی تریش دەڵێین ئەوروپا ئازادو سەربەستە لەوەی چ بە ئایینەکەی خۆی دەکا!

بەڵام ئەو عەلمانیانەی ناوی ئیسلامیان هەڵگرتوەو چی وای لێکردونە هەتا هاوار بکەن بەوەی کە ئەوروپا لەمەو پێش هاواری بۆ کرد، هەروەها لە ئایین ڕابکەن و بانگەشەش بۆ لە ئایین ڕاکردن بکەن هەروەکو، کە ئەوروپا لەمەو پێش وای کرد، خۆ ئایینیان وەکو ئایینی ئەوان نیە، بارو دۆخیشیان وەکو بارو دۆخی ئەوروپیەکان نیە؟!

مرۆڤێك دەڵێ لەبەر ئەوەی درکێك لەپێی ڕاچووە کاتێك پێ دادەگرێتە سەر زەوی ئازاری دەدات، جا مرۆڤێکی تر دێت، کە پێیەکانی ساغ و سەلامەتن و دەڵێت: منیش دەمەوێ وەکو ئەم پیاوە بشەلم، چونکە شەلایەتیەکەی سەرنجی ڕاکێشاوم!!

چیمان داوە لەمە!

ئێمە باسی ئەو خۆشی و شادیە دەکەین، کە عەلمانیەکان لە بارەی جیهانگەری ( عولمة )وە باسی لێوە دەکەن، هەروەها ئەو خۆشحاڵیە گەرمەی، کە هەواڵەکانیان پێش وازی لێدەکەن، هەروەها ئەو موژدانەی، کە پەخشی دەکەن بەو خێرو خۆشیەی کە لە ئەنجامی جیهانگەری ( عولمة )وە پێمان دەگات!

﴿ وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ

الَّذِينَ مِن دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ: جا هەر کات ناوی خودای یەکتا بەیاد بکرێ، ئەو کەسانەی باوەڕیان بەو دونیا نیە، دڵیان بەو ناوە دەشێوێ، ئەگەر باسی جگە لە خودایان لا دەڵێن وە کەیف دێن﴾ زمر:٤٥.

لە زۆرترین ئەو موژدانەی بڵاوی دەکەنەوە _ هەروەکو هەندێکیان وتویانە _ لەناو بردنی ئایینە!

عەلمانیەکان ئەگەر بیان وتبایە ئەو واقیعەی ئەو ئوممەتە تیایدا دەژی، کە واقعێکە لەو پەڕی خراپی دایە لەهەموو بوارەکانی و، دەبێ هەر چاکی بکەین، ئەوا لەگەڵیاندا بەبێ ناکۆکی دەگەیشتینە ئەنجام، چونکە ئێمە بەردەوام ئەو ڕاستیە لە هەموو کۆڕو بۆنەیەکدا دووبارە دەکەینەوە..

بەڵام جیاوازیە ڕیشەییەکەی نێوان ئێمە و ئەوان ئەوەیە، دیدو بۆچونی ئەوان بۆ ئەو هۆیەی، کە گەیاندیتیە ئەو بارو دۆخە، هەروەها دیدو بۆچونیان بۆ ڕێگای چارەسەر کردنی ئەم بارو دۆخە. ئەوان دەڵێن بەڕاستی (( ئایین )) سەبەبکاری هەموو دەردو بەڵاو مەینەتیەکانە، چارەسەریەکەش فڕێ دانی ئایینە، یان سنوردار کردنیەتی _ هەروەکو ئەوروپا وای کرد _ ئێمەش دەڵێین دوورکەوتنەوە لەڕاستی و دروستی ئایین سەبەبکاری هەموو دەردو بەڵایەکانە، بۆیە چارەسەریش گەڕانەوەیەکی ڕاستگۆیانەیە بۆ ئەم ئایینە.

ئێمە لێرەدا دەربارەی بیرو بۆچونەکانیان مشت و مڕیان لەگەڵدا ناکەین[1].. بەڵکو مشت و مڕ لەسەر ئەو خۆشحاڵیەو موژدەکانیان دەکەین.. کە ئایا لەسەر بنچینەیەکی ڕاست چەسپاوە ؟ یان ئەوان خەون دەبینن؟ یان ئەوان ئاوات

1 / ئەم باسەمان بەدرێژی لە کیتابی ( قضية التنوير في العالم الاسلامي ) ڕوون کردۆتەوە.

دەخوازن، پاشان ئاواتەکەیان بەڕاست دەزانن؟!

ئایا بەڕاستی جیهانگەری ( عولمة ) شەپۆلی ئیسلامی لەناو دەبا ؟!

ئێمە بە پێچەوانەوە دەڕوانین، بەڵکو دەڵێین دەبێتە هۆیەکی بەهێز لە هۆیەکانی بڵاوبونەوەی ڕابوونی ئیسلامی لەهەموو کون و کەلەبەرەکاندا!

﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِؤُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ، هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ: گەرەکیانە تیشکی خوداً هەر بەفوی دەم وەکو ژێنن. خواش تیشکی خۆی هەر سەر دەخا جا با خودا نەناسانیش خۆشیان نەیە. ئەو خودایە پێغەمبەری خۆی بەرێ کرد. بۆ ڕێبەری و ڕاگەیاندنی دینی ڕاست. تا سەری خا بەسەر هەموو دینەکاندا؛ جا با بت پەرستەکانیش خۆشیان نەیە﴾ صف:٨،٩.

لە کاتی خۆی، لەسەرەتای پەنجاکاندا، (( توینبی )) مێژوو نووسی بەریتانی بەناوبانگ وتارێکی پێشکەش کرد بەناو نیشانی ((الاسلام والمستقبل _ ئیسلام و دوارۆژ ))، کە تیایدا وتی: بەڕاستی ئێستا ئیسلام نوستوە، وەکو نوستنی یارانی ئەشکەوت. بەڵام نوستوو کاتێك بە ئاگادێتەوە، هۆی بەئاگا هاتنەوە هەبوو. پێشتر ئیسلام دووجار بوونی بەهێزی خۆی چەسپاندوە لە مێژووی خۆی، یەکەمیان کاتێك نیوەی ئیمپراتۆریەتی یۆنانی لەچەند ساتێکی کەم دا ڕامالی، دووەمیان کاتێك سەرکەوت بەسەر خاچ پەرستەکان لەسەدەکانی ناوەڕاستدا. ئەمڕۆش چەند گەلێکی پرۆلیتاری هەنە ( مەبەستی ئەو گەلانەیە کە زەبوون و سەر شۆڕن، کە شۆڕش دژی بەرپا ناکەن ، مەبەستیشی پێیان گەلانی (( جیهانی سێهەمە)) ) کە ڕۆژئاوا بەکاریان دێنێ بۆ بەرژەوەندی خۆی و فشاریان دەخاتە

سەر. ئەنجا ئەگەر فشارەکە توندو تیژ کرا لەسەریان، ئەوا ئەو گەلانە دەجولێن بۆ ئەوەی قەوارە زەوت کراوەکەیان بگەڕێننەوە، لەو کاتەدا ئیسلام ئەو هەلە دەقۆزێتەوە بۆ ئەوەی سەرکردایەتی ئەم بزوتنەوەیە بکات و ڕابەرایەتی ئەم گەلانە بکات بۆ بەربەرەکانێیان لەگەڵ ڕۆژئاوادا.. لە کۆتاییدا وتی: هیوام وایە، کە ئەمە ڕوو نەدات!!

بەڵام ئەوەی، کە (( توینبی )) لێ ی دەترساو، هیوای وابوو ڕوونەدات، ئەوە بوو ڕویدا، ئەم ڕابوونە ئیسلامیە درووست بوو هاتە کایەوە لەگەڵ ئەو هەموو جەنگەی، کە کراوە سەری، یان بەڵکو بەهۆی ئەو جەنگانە بوو دروست بوونەکەی!

ئەمڕۆش جیهانگەری ( عولمة ) دێت بۆ ئەوەی هەڵوێست و ڕووداوەکە زیاتر دابگرسێنتەوە و پەرەی پێ بدات!

بەڕاستی جیهانگەری ( عولمة ) خراپترین و دژوارترین جۆری داگیرکەرە، کە زەوی بەخۆیەوە بینیبێ.. جۆرێکی توندو بەهێز و زۆردار، کە نایەوێت تەنها قوت و زەخیرەی گەلان بدزێت و بەکاریانبێنێ، بەڵکو دەیەوێ کەسایەتیان بسڕێتەوەو بیان کاتە دەست و پێوەند و بەندە.

کاردانەوەی چاوەڕوان کراوو پێش بینی کراو _ با پاش ماوەیەکیش بێت _ بریتیە لە شۆڕشی ئەو گەلانە بۆ ئەوەی قەوارەکەیان بگەڕێننەوە، هەروەها بجولێن و هەوڵ بدەن بۆ گێڕانەوەی ئەوەی لێیان زەوت کراوە لە کەرستە خاوەکان و سامان و، کەرامەت و هۆش و دڵیان..

ئیسلامیش دەبێتە سەرکردەی ئەم بزووتنەوە ڕزگاری خوازیە!

هەڵبەت عەلمانیەکان پڕ بەدەمی خۆیان پێ دەکەنن و پێمان دەڵێن: ئێوە خەون دەبینن، پاشان خەونەکانتان بەڕاست دەزانن، ئەوا ئەو ڕاماڵـە سـڕێنەرەوەتان بـۆ هاتووە، کە هیچ ناهێڵێتەوەو بەجێ نـاهێڵێ، هـیچ کەسـێکیش توانـای نیـە لـە بەرامبـەری ڕاوەسـتێ! چ جـای ئـەو بـێ هێـزو لاوازانـە، کـە کۆنەپەرسـت و دواکەوتوون، ئەوانەی لە چەرخی ڕۆشنگەری دا بە عەقڵیەتی سەدەکانی ناوەڕاست دەژین!

ئێمە دەڵێین، ئێمە زۆر واقعینە، بەچاوپۆشین لەوەی دەروونەکان دەیانەوێ، چونکە دەروونەکان بـەردەوام ئـەوە داوا دەکـەن، کـە ئارەزوویـان لێ یـە، بـەلاّم هەندێك کەس هیوادەخوازن و خەونیان هەیە، بەلاّم خەون دەبینن، خـەڵکانێکیش هیوادەخوازن بەلاّم واقعینە، کە شوێن پێی خۆیان دەناسـنەوەو دەزانـن کۆسـپ و تەگەرەکانی ڕێگا چیە.

با ڕووداوێکی دیاری کراو وەرگرین و، با نیشانەو مانای لێدەربینین.

ئەم ڕوداوە ڕۆمانی (ولیمة الأعشاب البحر)ە..

هیواو ئاواتی ئەوانەی هەستان بەدوبارە بلاّوکردنەوەی ئـەو ڕۆمانـە ئـەوە بوو، کە کۆمەڵگا بگاتە ئەو حاڵەتەی، کە جنێو بـەخواو پێغەمبەرەکـەی بـدرێ، هەروەها گاڵتە بە ئایینەکەی بکرێ، سوکایەتی و قەشمەری بەچەمك و ماناکـانی بکرێت، پاشان هیچ نەجولێ!

بەلاّم ئەوان _ بەگەوجێتی خۆیان _ هێلە سورەکانیان بەزاند!

لەوکاتەدا ڕوداوەکە ڕویدا، کە بەبیری کـەس دا نـەدەهات، کـە ڕوبـدات، بەیەك جار ئایینە خەفەکراوەکە تەقیەوە، خەڵکانێك هەستاو غیرەتـی جـولاّ، کـە

پێش بینی نەدەکرا بجوڵێ، خەڵکانیش نارەزایی خۆیـان دەربـڕی کـە پـێش بینـی نەدەکرا نا ڕەزایی دەربڕێ!

ئەو ڕوداوە ماناو بەڵگەی خۆی هەیە..

عەلمانیەکان ماوەیەك هێرشیان کردە سەر ئاین، خەڵکیش بێـدەنگ بـون. ئەو بێدەنگ بونەی خەڵکی تەفرەی دان و لە خـشتەی بـردن، بۆیـە ئـەوان زیـاتر بەردەوام بون لـە هێـرش و پـەلاماری خۆیـان، پـشت بەسـتو بـەو هێزانـەی کـە پارێزگاریان لێ دەکەن لەو کاتەی هێرش دەکەنە سەر ئاین..

بەڵام ئەوان _ لە قوللە(برج)ە خوارەکانیان _ چارەسـەری چـەند (( کـارو بارێکیان )) دەکرد، کە حەق و ناحەقی تێکەڵ دەبوو، کە کـەس نەدەکەوتـە ژێـر کاریگەری مەگەر ژمارەیەکی دیاری کراو لە خەڵك نەبێت، ئەگـەر چـی بەگـشتی دەبووە مایەی بێز لێ بوونەوەو نارازی بوونی خەڵکی.

بەڵام کاتێك دەست لەو کارو بارە درا کە لە ( ئاین دا زەرورو گرنگە ) لـە پاك گرتن و پیرۆزی خواو، ڕێزگرتن لە پێغەمبەرو ڕێزگرتن لەو ئایینـەی لەلایـەن خواوە هاتۆتە خوار.. ئەوا لەو کاتەدا ئەوەی لەسەر یەك کەڵەکە بوو بوو هەمووی تەقیەوە، سەرەڕای ئەو هەموو ترسناکیەش، کە لە دەوری تەقینەوەکە بوون!

جیهانگەری ( عولمة ) هەمان گەوجیەتی ئەنجام دەدات..

هێڵە سورەکان دەبەزێنێ!

لە کـۆنگرە بـێ شـەرمەکانیان داوای بـێ سـەروبەری(فوضـی)ی ئـاژەڵی دەکەن، داوای پێدانی شـەرعیەت دەکـەن بـۆ خراپـەو خراپـەکاری و لارێ بـون و ڕێزپەرپی(شـذوذ).. کە لەمانەدا ( کودەتاچیەکان _ المتـآمرون ) هێڵـە سـورەکان

دەبەزێنن دەست دەدەن لەوەی (( لە فیترەتدا زەرورو گرنگە )) ئەنجا شتە کپ بوو پەنگ خواردوەکان دەتەقنەوە!.

ئەمە بێجگە لەو فشارە ئابوری و سیاسیەی، کە لەگەڵ عەولەمەدایە، کە لە کۆتاییدا بەرەو تەقینەوە دەڕوات..

جیهانگەری ( عولمة ) _ چ ئەمریکی تەواو بێت، یان جولەکەی تەواو، یان تێکەڵێکی هاوچەشنی هاوکار بێت لە ئەمریکاو جولەکە _ ئەوا لە دواجارو کۆتایدا _ زۆر بە گەوجیەتی _ دژی بەرژەوەندیەکانی خۆی کار دەکا!.

.....................................

## ئاییندەی جیهانگەری ( عولمة )

غەیب و پەنهانی تەنها خوا دەیزانێ..

﴿ قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّـهُ...: بڵێ: ئەوانە وا لە ئاسمانەکان و زەمیندا هەن _ لە خودا بەدەر _ لە نادیار بێ خەبەرن﴾ نمل: ٦٥.

بەڵام لێرەدا خودا چەند شێوەی کار(سنة)ێکی هەیە، کە بەسەر ژیانی مرۆڤدا تێدەپەرن ، ئەو شێوەی کارانە نە بەدوا دەکەون و نە دەگۆڕێن، هەروەها خوای گەورە چەند بەڵێن و هەڕەشەی هەیە بە هەمان شێوە نە دەگۆڕێن نە بەدوا دەکەون، هەروەها واقعێکی بینراو هەیە کە دەکرێ ببینرێ و ئەندازەگیری ئەگەرەکانی بکرێت لەژێر ڕۆشنایی ئەو سوننەتانە و، ئەو مژدەو بەڵێن و هەڕەشەو ترسانە..

ئەمانە هەمووی دەڵێن ئەو جیهانگەریە، ئەنجا _ هەروەکو لە کۆتایی بەشی پێشو گوتمان _ ئەگەر ئەمریکیەکی ڕوت بێت، یان جولەکەیەکی ڕوت، یان تێکەڵێکی هاوچەشنی هاوکار بێت لە ئەمریکاو جولەکە، ئەوا زۆر لەسەر ئەم زەمینەدا ناژی هەروەکو، کە خاوەنەکانی هیواو ئاوات دەخوازن!

چونکە هەر لە سەرەتادا ئەو جیهانگەرە پێچەوانەی قەدەرێکی پێشوی خوایە، ئەویش: خەڵکی یەك ئوممەت نەبن لەسەر ئیمان، یان لەسەر کوفر: ﴿ وَلَوْ شَاء رَبُّكَ، لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلاَ يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ، إِلاَّ مَن رَّحِمَ رَبُّكَ وَلِذَلِكَ خَلَقَهُمْ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لأَمْلأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ: پەروەردگارت ئەگەر حەزی بکردایە، خەڵکی دنیای گشت دەکردە یەك ئایین؛ بەڵام بە ناتەبایی

هەر دەمێنێتەوە؛ {جا} پەروەردگاری تۆ مەگین بەزەیی پێیـان بێتـەوە؛ کـە هـەر بۆیەی دروست کردون. بڕیاری پەروەردگارت هەر دێتە جـێ، کـە! جەهەنـدەم لـە جنۆکەو بنیادەم _ هەموو پڕ دەکەم _ ﴾ هود: ١١٩،١١٨.

﴿...وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ آتَاكُم...:

ئەگەر خودا مەیلی لێ با، هەمووی دەکردنە یەك ئوممەت. بەڵام ویستی خـودا وابوو لەو شتانەی کە پێیداون بە تاقیتان بکاتەوە.. ﴾ مائدة:٤٨.

هەموو هەوڵدانێك بۆ ئەوەی خەڵکی بەیەك ڕەنگ ڕەنگ بکرێ، کـە ئـەو هێزە زۆرداره فەرزی دەکا، ئەوا هەر لەسەرەتاوە هەوڵدانێکی سەرنەکەوتووە ، بـا لەهەندێك شوێن لەزەویدا بۆیان سەر بگرێ بۆ ماوەیەکی دیاری کراو.

سەرنەکەوتووە، چونکە پێچەوانەی ویستێکی خوای ئەزەلیە، چـونکە هـەر خوا ئەندازەی شتەکان دادەنێ، نەك مرۆڤ· با لە ساتەکانی لـە خـۆ بـایی و خـۆ بەخوا زانینیان وا بزانن تواناداررن!

﴿ فَأَمَّا عَادٌ فَاسْتَكْبَرُوا فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَقَالُوا مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ، فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ: جا هۆزی عاد لە نـاڕەوا خۆیـان لـەو سـەر زەمینەدا بەزل زانی دەیانگوت: کـوا؟ کـێ لـە ئێمـە بـەهێزترە؟ نەیانـدیبو ئـەو خودایەی ئەوانی دروست کردوە گەلێك لەوان بەهێزترە؟ هەروا بە نیشانەکانمان بێ بڕوابوون. ئەوسا ئێمە ڕەشەبایەکی بەهێزمان _ لەو ڕۆژانەدا کە شومن _ نـاردە سەریان؛ ئازاری ئابڕو بەریان _ لە ژیانی ئەم دنیایـەدا _ پـێ بـچێژن. بێگومـان

سوکایەتی ئازاری ئەولاش زۆرترەو کەسیش بەهانایان نایە ﴾ فصلت: ١٦،١٥.

﴿...أَفَلَا يَرَوْنَ أَنَّا نَأْتِي الْأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا أَفَهُمُ الْغَالِبُونَ: ئەوندە نازانن ئێمە دێین و ئەم زەمینە _ لەهەموولا _ هەروا لێی کەم دەکەینەوە؟ ئاخۆ هەر خۆیان لەسەرن؟﴾ انبیاء:٤٤.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا وَاللّهُ يَحْكُمُ لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ: چۆن هێشتا نەیان زانیوە ئێمە دێین و _ لەگشت لا _ کەم دەکەینەوەو فەرمان ڕەوا هەر خودایەو کەس ناتوانێ دەس کاری خودابداو زۆر زوو بەحیساب ڕادەگا؟﴾ رعد:٤١.

بەڵێ دوو بارە سەرنەکەوتووە، چونکە پێچەوانەی سوننەتێکی تری خودایە، ئەویش: دەستاو دەست کردنی ڕۆژگارە لەنێوان خەڵکیدا ( واتە بەمانای سەرکەوتن و دۆراندن هەروەها بە دەسەڵات بوون و لاچوون ).

﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ وَتِلْكَ الأيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ...: ئەگەر ئێوە بریندار بوون، دوژمنیشتان وەکو ئێوە بریندار بووە. ئێمە ئاوا لەناو خەڵکا زەمانە دەستاو دەست دەکەین﴾ ال عمران: ١٤٠.

پاشان _ لە واقیعی ئێستادا _ جیهانگەری ( عولمة ) لەچەند شوێنێکدا تووشی بەربەرەکانێ و ڕووبەروو بونەوە بووە! لە ئەوروپاو فەرەنساو ئەڵمانیا شەرم دەکەن لەوەی ئەمریکا ڕێگای ژیانیان بۆ دابنێ، زۆر بەتوندیش ڕادەوەستن بەرامبەر هەر هەوڵدانێك بیەوێ کەسایەتیان بسڕێتەوە، یان بیەوێ مۆرکێکی پێوەبنێت، ئەنجا چ لە جیهانی زمانەوانی بێت، یان هزر، یان ڕۆشەنبیری، یان هەڵس و کەوتی ڕۆژانە بێت، ئەمە بێجگە لە سیاسەت و ئابوری.

لە کیشوەری ئاسیاش چین و یابان هەنە، کە هەردووکیان هێزێکی بنـەڕەت و جێگیرن لە زەویدا، کە سڕینەوەو سەر شۆڕکردن و لەناو بردنی نیشانەو ئادگاری ئاسان نیە، هـەروەها تواندنـەوەی کەسـایەتیان ئاسـانیش نیـە هـەروەکو، کـە ( جیهانگەری ) ئارەزوو دەکـا. ئەمـە بێجگـە لـە بزاڤـی ئیـسلامی، کـە ئێـستا خەفـەکراوە بەهـەموو هۆکـارێکی خەفـەکردن، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا زینـدوەو بەرامبەر هەر هەوڵدانێك ئاسانیش نیە، کە بیـەوێ زینـدە بەچـاڵی بکـات، یـان ڕێگەی لە بڵاوبونەوەی بگرێت.

  

گریمان، جیهانگەری ( عولمة ) ئەمریکی بێـت،خودی ئـەمریکا لـەناوە خۆیـدا لەبەردەم هەڕەشەی ڕوخان و دارمان دایە! ئـەم گوتەیـەش وەنـەبێ بیلـێین و هـی خۆمان بێت، بەڵکو ڕۆژنامەو نوسەرو ڕووناك بیرەکانیان وا دەڵێن.

بەڕاستی ئەمریکا هێزو توانایەکی ئێجگار گەورەو زەبـەلاحی هەیـە، کـە زەحمەتە هەتا بۆ هێزەکانی تری جیهانیش بتوانێ بێتە پێشی و ڕوبەڕوی ببێتـەوە، بەڵام هێزو توانا ی ماددی لە کۆتاییدا بڕیار لەسەر چارەنوسی ئومەتەکان نـادات، یان بەکەمی بەتەنیا بڕیار لەسەر چارەنوسییان نادات.. جا کاتێك خۆش گـوزەرانی و ئاسودەیی لەسـنور دەرچـوو بـڵاو دەبێتـەوە و بەربـەرەڵلایی و گەنـدەڵی بـڵاو دەبێتەوە ( هەروەکو کە کلینتۆن لەچەند وتەیەك ئاگاداری و هۆشداری گەلەکـەی خۆی کـردەوە ) کاتێـك، بـێ سـەروبەری جنـسی و لاڕێ بـون و ڕیزپـەڕیی بـڵاو دەبێتەوە، کە ئەو هەموو بەد ڕەوشتیەو بەربەڕەڵلاییە بە ئاشکرا دەکەن و داوا لە

دەستورو پەرلەمانیان دەکەن، کە شەرعیەت بدەنە ئەو شتانەو شەرعیەت بداتە هەڵس و کەوتە لارێ بووەکانیان.. کاتێك عارەق و ماددە سڕکەرەکان و تاوان بڵاو دەبێتەوە.. ئەمانە هەمووی پنیشانەی کاول بون و دارمانە، با هەرچەند هێزی ماددیش هەبێ..

ئێمە ناڵێین ئەمریکا سبەی بەیانی لەناو دەچێ و دەڕوخێ! چونکە بە گوێرەی سوننەتی خوا ئەو هۆکارە، بەهێزو ئیجابیانەی هەیەتی، بۆی هەیە ماوەیەك تەمەنی درێژ بکات. بەڵام دەڵێین ئەو جیهانگەریەو ئەوەی لەگەڵی دایە، پێش بینی ناکرێت و تەمەنی ئەوها درێژ بێت.

ئەگەر ئەو جیهانگەریەش جولەکەیی بێت و کاربکا لەپشت ئەمریکا، کە ئەمەیان لە دیدو بۆچونی ئێمە ڕاسترە، ئەوا بۆ جولەکەکان مژدەو ترس هەیە لە کیتابی خوا: ﴿ وَقَضَيْنَا إِلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ فِي الْكِتَابِ لَتُفْسِدُنَّ فِي الأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا، فَإِذَا جَاء وَعْدُ أُولاهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَا أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُواْ خِلاَلَ الدِّيَارِ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولاً، ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ الْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَاكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَاكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا، إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا فَإِذَا جَاء وَعْدُ الآخِرَةِ لِيَسُوؤُواْ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُواْ الْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوْاْ تَتْبِيرًا، عَسَى رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا...: هەر لەناو کتێبەکەدا ئاگاییمان بەنەوەی ئیسرائیل دا، کە: ئێوە لەم سەر زەمینە _ لە دوو هەلدا _ مل لە بەدفەڕی ددنێن و زۆر بە توندی بادی هەوایی دەنوێنن. هەر کاتێك یەك لەو دوو هەلانە هاتەدی، چەند بەندەیەکی هەرە ئازای خۆم ناردنە سەر، گشت وڵاتیان لێ ئاژنین، ئەم بڕیارەش جێ بە جێ بوو. لە پاشان

کارێ وامان کرد، ئێوە لەوان بەهێزتر بن؛ هەژماریشتان فرەتر بێ و بە دارایی و منالّیش یارمەتیمان پێ گەیاندن. ئەگەر ئێوە چاکە بکەن، چاکەی دەگەڵ خۆتان دەکەن؛ ئەگەریش خراپەتان کرد، لەخۆتانە هەرکاتێکی بەلّێنی پاشین هاتە جێ، دیسان دەنێرینە سەرتان، واتان لێ کەن پەژارەو خەم لە ڕوخسارتانا دیاربێ و تا بشچنە مزگەوتەوە _ وەك جاری پێشو کە چونێ _ هەر چێکیشیان دەسکەوێ تەفرو توانی کەن. بەشکۆ پەروەردگاری خۆتان بتانخاتە بەر بەزەیی. ئەگەریش بگەڕێنەوە دەگەڕێینەوە﴾ اسراء: ٤_ ٨.

یەکسانیشە _ هەروەکو کە لەمەو پێش ئاماژەمان پێ کرد _ ئەو دوجارەی، کە باس کراوە لە مێژودا ڕویدا بێت، یان یەکێکیان لە مێژوو ڕویدا بێت ئەوی تریان ئەمڕۆ ڕویدابێت.. جا ئەو گوتەیەی کە خوا دەفەرموێ ﴿ وان عدتم عدنا: ئەگەر بگەڕێنەوە دەگەڕێینەوە﴾ ئەوا جیاکەرەوەی ئەوەیە، کە ئێمە باسی دەکەین ئەو ئایەتانە دەڵێن: هەر کاتێك جولەکە بەرز و بەهێز و توانا و دەسەلاّت بوون لە زەوی و، خراپە و خراپەکاریان ناوە _ ئەنجا جارێك بێت یان چەند جار _ ئەوا خوای گەورە لەو بەرزیەی، کە هەیانە نزمیان دەکاتەوەو ترس و بیمی خۆی دەهاوێتە سەریان ﴿ وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبْعَثَنَّ عَلَيْهِمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَن يَسُومُهُمْ سُوءَ الْعَذَابِ...: ئەو کاتەش و لەبیر بێ کە پەروەردگاری تۆ ڕایگەیاند: دەیانکەمە بەر فەرمانی کەسانی وا کە تا قیامەت _ بەتوندی _ ئازاریان دەن﴾ اعراف: ١٦٧.

وا ئەمڕۆش لە لوتکەی بەرزی دانە.. بەڵکو لە مێژووی خۆیان لەمەوبەر، هەرگیز ئەوها بەهێزو دەسەلاّت نەبوینە لە سەرانسەری جیهاندا.

هەر خواشە ئەندازە گیری شتەکان دەکات، حیکمەت و دانایی ئەو ئەندازە گیریەش هەر بۆ ئەوە، ئەنجا ئەگەر ئێمە حیکمەتەکەمان زانی، یان نەمانزانی.

بێگومان دانایی و حیکمەتی هەیە لەڕێ پێدانی جولەکەکان و دەسەڵاتداریان لەسەر زەوی ﴿ ضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ أَيْنَ مَا ثُقِفُواْ إِلاَّ بِحَبْلٍ مِّنْ اللَّهِ وَحَبْلٍ مِّنَ النَّاسِ...: لەهەر جێگایەك بن، هەر ژێر چەپۆکی و زەبوونی بۆتە بەشیان، جا مەگین هەر پەیمان دەگەڵ خوداو خەڵکا بگاتە فریایانەوە﴾ ال عمران:١١٢.

ئەوان، کە ئێستا دەسەڵاتدارن، ئەوە لەسەرەتادا بە ئەندازەگیری و خوا ئەوها دەسەڵاتدارن، پاشان بەیارمەتی خەڵکیش، ئەوانەی یارمەتی یان دەدەن و پشتیان دەگرن لە جێ بە جێ کردنی پلانەکانیان.

بەڵام دانایی و حیکمەتی ئەم کاروبارە ئەوە ئێمە نایزانین، چونکە نە لە کیتابی خواو نە لە فەرموودەی پێغەمبەردا باس نەکراوە، بەڵام ڕەنگە خودای گەورە سزای مرۆڤایەتی بدات بەو کوفرەی کردویانە، کە هێشتا مرۆڤایەتی لەمەو پێش ئەم جۆرە کوفرەی نەکردوە، کە نکوڵی لە بوونی خوای کردووە( لە بەشێکی کەمی نەبێت) لە ڕێنمایەکەی لایان داوە ( لە بەشی هەرە گەورەیدا ).
هەروەها سزای ئەو ئوممەتە ئیسلامیەش دەدات لەسەر تەمبەڵی و کەم تەرخەمیان.. بەڵکو سزای هەموان دەدات بەزاڵ بوونی جولەکە بەسەریاندا بۆ ئەوەی گوتەی خوای گەورە بێتە دی، کە دەفەرموێ ﴿ قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَن يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِّن فَوْقِكُمْ أَوْ مِن تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعاً وَيُذِيقَ بَعْضَكُم بَأْسَ بَعْضٍ...: بڵێ: خودا توانای هەیە کە لەلای سەروتانەوە یان لەلای ژێر پاتانەوە ئازارتان بۆ بەرێ بکا، یان بتانکاتە چەند دەستەو تێکتان بەرداو ئازار لە یەکتر بچێژن﴾ انعام: ٦٥. جا حیکمەت و داناییەکە هەر چیەك بێت،

ئەوەی لێرەدا بۆمـان گرنگـە ئەوەیـە، کـە ئـەو لوتبـەرزی و هێـز و دەسـەڵاتەی جولەکەو هەروەها ئەو خراپەو خراپەکارییەی، کە دەینێنـەوە ئـەوا لەلایـەن خـوا دیاری کراوەو سنوردارکراوە ، زۆر تەمەنی درێژ نابێت، چونکە ئەمـە هـەڵاوێردو جویێ کراوەیە لە بنکەکە نەك بنکەکە خۆی بێت، ئەگەرچی بنکەکە لـە ئەنـدازەو دانانی خوا بێت، هەروەها هـەڵاوێردو جـویێ کردنەوەکـەش لـە ئەنـدازەو دانـانی خوایە.



ئەمەش مانای ئەوەنیە، کە جیهانگەری شـتێکی گـرنگ نیـەو ئەوەنـدەی نایینی گرنگی پیێ بدەین و لێـی بترسـێین جوولـەو بـزووتن نەکـەین بەرامبـەری.. بەڵکو جیهانگەری، گەردە لولێکی بەکارەسات و لەرپیشە هەڵکێشە..

گەردەلولیش پاش ماوەیەك هێور دەبێتەوە، بـەڵام دوایـی ئـەوەی وێرانـی کردیەو ئەوەی خراپی کردیە، خراپی کردیە کـە چـاك بوونەوەکـەی دەیـان سـاڵی گەرەکە..

بەڵکو دەڵێینە ئەو خەڵکەی، کە لەناو جیهانی ئیسلامیدان، بـە گـوێرەی تواناتان خۆتان بپارێزن لەم گەردە لولەهەڵەشەو بەکارەساتە، خۆتـان بپـارێزن بـە پلەی یەکەم بەدەست گرتن بە ئاین و ڕەوشـت و شـتە نـەگۆڕەکانتان، پاشـان بـە پلەی دووەم خۆتان بپارێزن بە بەگەڕخستنی هەموو توانایەکتان بۆ دەست خستنی زانست و شارەزایی و وەبەر هێنانی زیاتر، بەڵکو بـەو کارەتـان شـوێنەواری ئـەو کاول بوونە کەم بکەنەوە، کە لە دوای گەردەلوولەکە بەجیێ دەمێنیێ.

پاشان پێیان دەڵێین هەروەکو موسـی _ علیـه الـسلام _ وتیـە گەلەکـەی

کاتێك، کە لە گەرمەی تاقیکردنەوەدا بوون: ﴿اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُواْ إِنَّ الأَرْضَ لِلّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ: هەر پشت بە خودا ببەستن و خۆ ڕاگر بن؛ ئەم زەمینە هی خودایە، بەهەر کەسێ لە بەندەکانی خۆی حەز بکا، پێی دەبەخشێ و دوارۆژیش بۆ ئەوانەیە کە لە خوا ترسیان هەیە﴾ اعراف: ١٢٨.

........................................

# پێرست